بەرپرسیارە لەکرداری ڕۆشنەپێکهاتن، کلۆرۆفیل، هەروەها گازی $CO_2$ ئەو گازەیە کە پارێزگاری گەرمی ئاووهەوای گۆی زەوی لەشەودا دەکات، لەبەرئەوەی تیشکدانەوەی زەوی بەزۆری دەفرێت و ڕێگە لەڕۆچوونی بۆ گەردونی دەرەوە دەگرێت.

ئەو سێیەکی دەیەی لە١٪ ماوە لەقەبارەی هەوای وشك بریتییە لەکۆمەڵێك گازی سست ئەوانیش: نیۆن، هیلیۆم، هیدرۆجین، کریبتۆن، لەگەڵ هەندێك پیسبوونی جیاوازی وەك ئۆزۆن، یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن، هیدرۆکاربۆنەکان تەنۆلکەی ڕەق و مادە شلەکان.

هەموو ئەو ڕێژانەی ئێستا باسمان کردن لەبارەی پێکهاتوی بەرگی هەواوە، لەسەر ئەو بناغەیە دانراون کە هەوا وشکە، لەڕاستیدا ئاووهەوا هەرچەندە وشك بێت هەر بەتاڵ نییە لەهەڵمی ئاو، بە بەردەوامی ئەم هەڵمە هەیە، ئەم ڕێژەیە دەگاتە نزیکەی سفر لەسەد لەهەوای بیابانەکان بۆ نزیکەی ٤٪ ی قەبارەی هەوا لەسەر دەریاو زەریاکان.

لەگەڵ کەمی ئەم ڕێژەیەدا، هەر بەپرسیارە لەدیاردەکانی ئاووهەوا وەکو هەورو باران و بەفر، جگە لەوەی کەبوونی هەڵمی ئاو لەچینەکانی هەوای ژێرەردا زیاد دەکات، دەبێتە هۆی مژینی بەشێك لەتیشکی خۆر بەوەش پلەی گەرمی دەوروبەر دەپارێزێت. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە تیشکی خۆرو هەڵمی ئاو دەورێکی سەرەکی لەکرداری پیسبووندا دەگێڕن.

ئۆکسیدەکانی گۆگرد لەگەڵ هەڵمی ئاوی هەڵواسراو لەهەوادا یەك دەگرن و ترشەکانی گۆگرد پێك دەهێنن، کە بە بارانی ترشی ناسراوە هەروەها ئۆکسیدەکانی نایترۆجین لەگەڵ هیدرۆکاربۆنەکان یەك دەگرێت ئۆزۆن پێك دێنێت، گازی ئۆزۆن لەچینە بەرزەکانی هەوا بەهۆی کاری تیشکی سەروو وەنەوەشەییەوە دروست دەبێت ئەگەر ئێمە بەراوردی نێوان پیسبووە هەڵواسراوەکانی هەواو قەبارەی کۆتایی بەرگە هەوایەکەی دەوری گۆی زەوی بکەین، دەبینین ئەم ڕێژەیە زۆر کەمە بەشێوەیەك باس ناکرێت، بەشێوەیەك بۆچونمان وادەبێت هەر لەجاری یەکەمەوە کە هیچ ترسێك بۆ دانیشتوانی ئەم ئەستێرەیە دروست ناکات، هەرچەندە لەلایەکی دیکەوە دەبینین کە ئەو پیسییانەی فڕێ دەدرێنە هەواوە زیاتر لە١٠٠ملیۆن تەن دەبن.

لەوڵاتێکی وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پیسبووەکان لەساڵی ١٩٧٧ گەیشتە (١٩٤ملیۆن تەن)، پیسبووەکانیش ئەمانە دەگرێتەوە: یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن، تەنۆلکە هەڵواسراوەکان ئۆکسیدەکانی گۆگرد، ئۆکسیدەکانی نایترۆجین، هیدرۆکاربۆنەکان.

تەنۆلکەبچوکەکان: لەوانەیە ئەم تەنۆلکانە ڕەق بن یان لەشێوەی دڵۆپەکانی شلەدا بن، لەبەر بچوکیان بەشێوەی هەڵواسراو لەهەوادا دەمێنێتەوە، ئەم تەنۆلکەبچوکانە بەهەڵواسراوی لەهەوادا دەمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژ کە با بۆ رووبەری دووری دەیگوێزێتەوە، ئەو گەردیلانە دەگەنە هەوا بەهۆی کاری چالاکی پیشەسازییەوە، هۆکارە جیاوازەکانی گواستنەوە، هۆکارە سروشتییەکانی وەك خۆڵ و تۆزەکان کە با خێرا دەیانگوێزنەوە، ئاگرکەوتنەوەی دارستانەکان و شۆڕشی بورکانەکان.

بۆ نمونە ڕێژەی ئەو تۆزو خۆڵەی لەبەرگی هەوادا لەکاتی بورکانی (کراکاتاو) یەکێکە لەدورگەکانی ئەندۆنیسیا-ساڵی ١٨٨٣ دەرچوو-بەدەیەها ملیۆن تەن مەزەندە دەکرێت، ئەو تۆزو خۆڵە لەدەوری گۆی زەوی بڵاوبۆتەوە بۆ بەرزاییەکانی دەگاتە نزیکەی ٥٠کیلۆمەتر.

ڕێژەی ئەو خۆڵەی لەسەرچاوە پیشەسازییەکانەوە بەرزدەبێتەوە بەکاری هۆکاری سروشتی لەسەر ڕووی زەوی نزیکەی ٧٠٠ملیۆن تەنە دەبێت هەموو ساڵێك.

توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ڕێژەی تۆزی نیشتو لەقاهیرە دەگاتە ٤٧٨تەن لەیەك میل دوجادا، (١٨٧ تەن لەکم[٢]) لەمانگێکدا، هەروەها ڕێژەی خۆڵو تۆزی نیشتو لەکوەیت لەماوەی مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٩ گەیشتە، (٢٣٩)تەن لەکم[٢] لەکاتێکدا نیوەی مانگی مارتی هەمان ساڵدا گەیشتە ٩٠تەن/کم[٢].

ئەم تەنۆلکانە زیان بەسییەکان دەگەیەنن لەبەر بچوکیان لەوانەیە لەگەڵ هەوادا لەڕێی بۆریچکەکانی هەواوە بچینە سییەکانەوە هەروەها لەوانەشە هەندێك تەنۆلکە بێتە هۆی هەوکردنی چاو و نەخۆشی هەستیاری هەروەها کاردەکاتە سەر کۆئەندامی دەماریش.

دوانۆکسیدی گۆگرد: ئەم گازە لەئەنجامی سوتاندنی سوتەمەنیە دەرهێنراوەکان (پەترۆل-خەڵوزی بەردین-گازی سروشتی) پەیدا دەبێت، ئەمیش گازێکی خنکێنەرە لەپیس

بـووه سـەرەکییەکانی ناوچـە پیشەسـازیەکان دادەنرێـت، بەتایبـەتی کـە ئێسـگەی هـێزی کارەبـای تیـادا بێـت. ئێسگەیەکی کارەبا بەخەڵوزی بەردین یان نەوت کاردەکـات بەهـەوادا ڕۆدەچێـت نزیکـەی چـەند تـەنێك لـەم گـازە لەسـەعاتێکدا، لـەکاتی سـوتانی ١٠تـەن لـەو خـەڵوزەی کـە ڕێژەیەکی زۆر گۆگردی تێدا بێـت، ئەوە نزیکـەی یـەك تـەن لەگازی دوانۆکسیدی گۆگرد دەردەچێتە هەواوەو کاردەکاتە سـەر کۆئـەندامی هەناسـەو دەبێتـە هـۆی هـەوکردنی بۆریچەکان، کۆکەڕەشە، هەلامەت ڕەبۆ، هەروەها وروژاندنی پێستو چاو.

ترسناکی ئەم گازە زیاد دەکات کاتێك ئاووهەوا شێدار بێت بەتایبەتی لەکاتی تەمدا یان کاتی باران بارین، ئەوکاتە لەگەڵ دڵۆپەکانی ئاودا یەك دەگرێت ئەو بارانە پێك دەهێنێت کە زیانێکی زۆر بەکانزاو بەردەکان، نایلۆن دەگەیەنێت، جگە لەو زیانەی بەمرۆڤ و گیانەوەرو ڕووەکی دەگەیەنێت.

ئەو ڕێژە بەرزبووەی ئۆکسیدەکانی گۆگرد لەوڵاتی کوەیت بە٢٠٤هەزار تەن مەزەنە دەکرێت لەساڵێکدا، لەکاتێکدا ئەم ڕێژەیە دەگاتە ٢٧ملیۆن تەن لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەهەمان ساڵدا.

یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن: گازێکی ژەهریە، ڕەنگو بۆنی نییـە، لەئـەنجامی سـوتانی ناتـەواوی سـوتەمەنیەوە پـەیدا دەبێت هـەروەکو ئۆتۆمبیلـەکان کە بەگەورەترین چاوگی ئـەم گازە دادەنرێن.

لەئامارێکدا وەکالەتی پارێزگاری ژینگەی ئەمریکی ساڵی ١٩٩٧ دەریخسـت کـە هۆکـارە جیاوازەکـانی گواسـتنەوە (ئۆتۆمبیـل-ئۆتۆمبیلـی گواسـتنەوە) نزیکـەی ٨٠٪ بەرپرسـیارە لـەگازی یەکـەم ئۆکسـیدی کـاربۆن، ئـەوەی ئۆتۆمبیلەکانو گالیسکە جیاوازەکـان فرێـی دەدەن نزیکـەی ٥٥٪ی کۆی پیسـبووەکان لەوڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا پێك دێنـن، ترسـی ئـەم گـازە لەزیادبوندایـە لـەو ناوچانـەی کە ئۆتۆمبیلی تیا زۆرە.

بەشیوەیەکی گشتی، ئەم گازە هەمیشە بەپلەیـەکی بـەرز لەهـەوادا نییـە، تەنـها لەناوەراسـتی شـاردا نـەبێت کـە ئۆتۆمبیلی تێدا زۆرە، بەتایبەتی لەکاتە جەنجاڵەکاندا.

نزیکەی یەك بەش لـەم گـازە لە١٠٠هـەزار بـەش لەهـەوا دەبێتە هۆی نەخۆشی، تەنانەت دەبێتە هۆی مردنیش کاتێك پلەی خەستی دەگاتە ڕێژەیەکی بەرز.

گـازی یەکـەم ئۆکسـیدی کـاربۆن جیگـەی ئۆکسـجین لەخڕۆکە سورەکاندا دەگرێتەوە، بەمەش ڕێژەی ئۆکسجینی ڕۆیشتو بۆ بەشە جیاوازەکانی لەش کەم دەبێتـەوە، ئـەوەی زانـراوە کـە بـەردەوامی کـەمی ئۆکسـجین کاردەکاتـە سـەر دەماغو دڵ.

لـەوڵاتی کوەیـت، دەردەکـەویت کـە ڕیـژەی گـازی یەکـەم ئۆکسیدی کاربۆنی دەرکراو بۆ هەوا دەگاتە (٥٠٢هـەزار تـەن) لەسالیکدا، ترسـناکترین شـت ئەوەیـە کـە ٨٤٪ ی ئـەم گـازە لەشاری کوەیتو دەورەبەرەکەی پەنگ دەخواتەوە.

لەوڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ئـەم گـازە (١٠٣ملیـۆن تەن)ی لێدەردەچیت لەسالیکدا.

**هیدرۆکاربۆنەکان:**

ئەم پیکهاتوانەش هەروەکو گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن لەئەنجامی کردارەکـانی سـوتاندنی ناتـەواوی سـوتەمەنیەوە پەیدادەبێت.

لەوڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ریـژەی ئـەم پیکهاتوانـە دەگاتـە (٢٨ملیـۆن تـەن) لەسـالیکدا، ٤٠٪) لەگـەڵ گـازە بێکەلکـەکان دەردەچیـت، لـەوڵاتی کوەیتـدا زۆربـەی ئـەم ئاویتانـە لـە: پالاوتگـەی پـەترۆل، یەکـەی بەرهەمـهینانی ئـەمۆنیا، جولـەی ریگاوبان پـەیدا دەبیـتو ریژەکـەی دەگاتـە ١١٦هـەزار تـەن لەسـالیکدا، زۆربـەی (٦١٪) لەناوچـەی شوعەیبەدا بەرزدەبیتەوە هەندیك بەلگە ئاماژە بەوە دەدەن کە هـەندیك لـەم پیکهاتوانـە ژەهراویـن، لەوانەیـە ببنـە هـۆی نەخۆشی ترسناك جگە لەوەی هەندیکی دیان لـەم پیکهاتوانـە ژەهـراوی نین، ترسناکی ئـەم پیسـبوانە بـەهۆی یـەکگرتنیان لەگەڵ ئۆزۆن یان ئۆکسیدەکانی نایترۆجین بەبوونی تیشکی خۆر زیاد دەکات.

**ئۆکسیدەکانی نایترۆجین:**

گازی ژەهرینن، دەبنە هۆی مردن ئەگەر بەخەستی بەرز لەهەوادا هەبن ئەم گازانە لەکاتیکدا پەیدا دەبن کەسوتەمەنی لەپلەیـەکی گـەرمی بـەرزدا بسوتیت، نزیکـەی ٥٦٠م، ئـەوەش دەبیتە هۆی سوتاندنی نایترۆجینی هەوا.

لەوڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا زۆربـەی ئـەم گازانـە (٥٠٪)ی کردارەکـانی گەرمکردنـەوە پیـك دەهینـنو (٤٠٪)ی لەگەڵ گازە بێکەلکەکان بەرهەم دین.

گرنگترین سەرچاوەی ئەم گازانـە لـەکوەیت ئیسـگەکانی پالاوتنـە، هۆکـارە جیاوازەکـانی گواسـتنەوەیە،و پاشمـاوە گازیەکان لەپالاوتگەکانی نەوتدا.

ئـەم پیـس بوانـە دەبنـە هـۆی وروژاندنـی چـاو زیـان بەسییەکان دەگەیەنن توندترین ترسناکی یـەکگرتنی دووەم ئۆکسـیدی نایترۆجینـە لەگـەڵ هیدرۆکاربۆنـەکان بـەبوونی تیشکی خۆر ئەم یەکگرتنەش دەبیتە هۆی پەیدابوونی گازی ئۆزۆنی ژەهری.

ئـۆزۆن: گـازی ئـۆزۆن لـەو چینـە بەرگـەی هـەوادا بلاودەبێتـەوە کـە دەکەوێتـە بـەرزایی نێـوان ١٥کـم و ٥٠کـم، ڕێژەی خەسـتی گـازی ئـۆزۆن لـەم چینـەدا دەگاتـە نزیکـەی ٨بەش بۆ هەر ملیۆنێك بەش لەهەوادا.

بوونی ئۆزۆن لەم بەرزاییانەدا ترسناکی ژەهراوێتی ئەم گازە لەمرۆڤ و ڕوەك و گیانەوەر دووردەخاتەوە.

ناوەندی خەستی ئەم گازە لەئاستی ڕووی زەویدا دەگاتە کەمتر لە٠,٠٧ بەش لەملیۆن، و ئەگەر ئەم پلەی خەستیبەش گەیشتە نزیکەی ٠,٥ بەش لەملیۆنێك لەماوەی چەند ڕۆژێکدا کە بلاوە لەولاتە پیشەسازیەکان و بەریتانیا ئـەوا بەشـێوەی Samog تەمومژ (تەم+دوکەڵ) دەردەکەوێت.

**دوانۆکسیدی کاربۆن:**

ئەم گازە بەکاری سوتاندنی سوتەمەنیە دەرهێنراوەکـان (پـەترۆل–خـەلوزی بەردینی گـازی سروشـتی) بەرهـەم دێـت، زاناکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لەسەرەتای شۆڕشی پیشەسازی لەخۆرئاوای ئەوروپا لەکۆتایی سەدەی ١٨هـەمدا ڕێـژەی گـازی دوانۆکسـیدی کـاربۆن هـەنگاو بەهـەنگاو لەبەرگیهەوادا دەستی بەزیادبوون کرد.

لەسالی ١٩٥٦ ڕێژەی کاربۆن بەشێوەی $CO_2$ کەدەچێتە هەواوە لەئەنجامی سوتاندنی سوتەمەنی دەرهێنراو نزیکەی (٢٢٠٠ملیـۆن تـەن)ە، بـەلام لەئێسـتادا ئـەم ڕێژەیـە لە(٥٠٠٠ملیۆن تـەن) لەساڵێکدا زیاتر دەبێت. ڕێژەی گازی $CO_2$ لەبـەرگی هـەودا لـەماوەی سـالی ١٩٥٧ هـەتا ئێسـتا بەرێژەی ٦٪ زیادبووە، هەروەها ئیستا کیشی تەواوی کاربۆن لەهەوادا بەزیاتر لە(٧٠٠) هەزار ملیۆن تەن مەزنە دەکریت.

لەتایبەتەکانی گازی $CO_2$کە ڕیگە بەتیپەربوونی تیشکی خـۆر بـەناو بـەرگی هـەواییدا دەدات و گەیشـتنی بـۆ زەوی لـەکاتیکدا ئـەو تیشـکی گەرمییـەی لەزەوییـەوە دەردەچیـت دەیمژیت و ناهیلیت بەرەو گـەردون دەرچیت، بـەو شـیوەیە پاریزگاری مانـەوەی گـەرمی لـەنزیك ڕووی زەوییـەوە دەکات، کە لەوانەیـە ببیتـە هـۆی بەرزبوونـەوەی پلـەی گـەرمی لـەم ئەستیرەیەدا ئەگەر بەرزبوونەوەی خەستی ئەم گازە لەبەرگی هـەوادا بـەردەوام بوایـە، هـەندیك لـەزاناکان پیشـبینی ئـەوە دەکـەن کـە ئـەم گەرمییـەی زەوی دەبیتـە هـۆی گـۆران لەکەشوهەوای ناوخۆیی جیهان.

بـەو شـیوەیە دەبنـین کـە پیسـبوونی هـەوا کاریگـەری زۆرخراپ لەسەر تەندروستی دەکات، ئەمەش لەسەر جـۆرو ریـژەی پیسـبوونەکە لەهـەوادا بـەندە، بەشـیوەیەکی گشـتی دەبیتە هۆی وروژاندنی هەریەك لەکۆئەندامی هەناسەو، چاوو لووت، جگە لەتوش بوون بەهەندیك نەخۆشی وەك نەخۆشی سـییەکان و رەبـوی بۆریچکـەکان، هەمیشـەش ریـژەی توشبوونەکە لـەلای توشبووەکان لـەکاتی پیسـبوونی هـەوادا زیاد دەکات.

پیسبوونی هەوا بەتەنها نابیتە هۆی توشبوون بەهەندیك نەخۆشـی یـان زیـادبوونی توشـبووەکان بەنەخۆشـی زیـاتر، بـەلکو دەبیتـە هـۆی مردنیـش، بەتایبـەتی کـاتیك دیـاردەی تەمومژ (تەم+دوکەڵ) ڕوودەدات.

ئەم دیاردەیە لەناوچە پیشەسازیەکاندا ڕوودەدات کاتیك دوکەلی کارگەکان تیکەڵ بەتەم دەبیت، ڕوودانی ئەم دیاردەیە بـوە هـۆی مردنـی ١٠٣کـەس لەگلاسـکو لـەپایزی سالی ١٩٠٩دا.

لـەوەدەچیت ئـەم ڕووداوە بەناوبانگانـە کـە هۆکـەی ئـەم جۆرە پیسبوونە بوو لە لەندەن لەماوەی نیوان ٥و٩ی مانگی دیسەمبەری سالی ١٩٥٢دا بوو کە بوە هۆی مردنی ٤٠٠٠کەس لەبەرئـەوەی تیکـەلی (تـەم+دوکـەڵ)و بـەهۆی جیگـیربوونی ئاووهەواوەو ڕاوەستانی بۆ ماوەیەك کە بۆتە هـۆی مانـەوەی ئـەم دیاردەیـە بـۆ چـوار ڕۆژ، پاشـان ئەنجامەکـەی: تەنگەنەفەسی (بەرهەنگ)، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش، شـینبوونەوەی پیسـت بـەهۆی کـەمی $O_2$ لەخویندا.

هۆکـارە سـەرەکیەکانی مـردن: هـەوکردنی تونـدی سییەکان و نەخۆشییەکانی دڵ.

چارەسـەر لەوانەیـە بەدروسـتکردنی پشـتینی سـەوز لـەدەوری کارگـەکان و نەخۆشـخانەکان و قوتابخانـەکان، و زۆرکردنی ڕووبەری سەوزی لەشارەکاندا، پاشان گرنگیدان بـەدانانی ئـامیری تایبـەتی بـۆ چـاودیریکردنی خەسـتی پیسـبوە جیاوازەکـان، بەجیـهینانی پشـکنینی خـولی بـۆ ئۆتۆمبیلـەکان و بلاوکردنـەوەی وشـیاری ژینگـەیی لـەنیوان هاولاتیاندا بیتەدی.

تۆبلییت ڕۆژیك بیت مرۆڤ لەبەکارهینانی وزەی کارەبادا سـەرکەوتوبیت بـۆ ڕۆیشـتنی ئۆتۆمبیلـەکان و دەسـتبەردان لەبەکارهینانی سوتەمەنی کـۆن، کـە لەملیۆنـەها ئۆتۆمبیلـدا دەسـوتیت و دەبیتـە هـۆی پیسـبوونی هـەوا بـەتۆزی یەکـەم ئۆکسـیدی کـاربۆن و ئۆکسـیدەکانی نایـترۆجین و پیکـهاتوە هیدرۆکاربۆنیەکان؟

**گومان لەوەشدا نییە کە:**

(مـرۆڤ بەتەنـها خـۆی دەتوانیـت ژیـانی لەپیسبوون ڕزگار بکات).

Internet

# وریابە لاوازبوونت

# کاریگەری بۆ سەر بەپیتیت دەبێت

**شادمان قادر حسن**

**مامۆستای دواناوەندی**

زاناکانی زانکۆی هارڤارد دەڵێن (دابەزاندنی کێشی ژنان لە ڕێژەی سروشتی خۆی زیاتر هەلی منداڵبوونی کەمتر دەکاتەوە.

واشنتۆن - لەوە دەچێت لاوازبوونیش لایەنی خراپی خۆی هەبێت بەم پێیە پسپۆرەکانی ئەم بوارە ئەو ژنانەی ئارەزووی پارێزگاری جەستەیەکی لاوازو باڵایەکی ڕێك دەکەن ئاگادار کردۆتەوە لەوەی ڕەنگە لەپاشدا بەدەست کێشەی منالبوون‌و نەبوونەوە بناڵێنن.

زاناکانی زانکۆی هارڤاردی ئەمریکی دەڵێن:" خواردنی خۆراکی کەم چەوری بە بەردەوامی‌و ئەنجام دانی ڕێژەیەکی زۆری وەرزشی جەستەیی بەشێوەیەکی جێگیر کاریگەری لەسەر توانایی ژنان بۆ منداڵبوون‌و سك پڕی دەبێت هەتا ئەگەر لەو پەڕی بەتوانایی‌و لەش ساغیش‌دا بێت‌و تەمەنی منداڵبوونی بەجێ نەهێشتبێت.

زاناکان لەو بڕوایەدان لەدەست دانی ڕێژەیەکی کەم لەکێش واتە بەڕادەی (٣پاوەن یان ١,٥کگم" وا لە ژنانی لاواز دەکات بچنە خانەی نەزۆکی‌یەوە، ئەوەی زانراوە کە کێشی زۆریان ئەوەی لە ڕێژەی سروشتی خۆی زۆر کەمتر بێت کاریگەری لەسەر هەلی منداڵبوون‌و سك پڕی دەبێت هەروەها ئەو ژنانەی کە پارێزگاری لەڕێژەی کەمترین چەوری دەکەن لەجەستەیان‌دا ئەوا خۆیان دووچاری مەترسی بێ (بێ‌پیتی) دەکەنەوە لەکاتێکدا ڕێژەی سروشتی چەوری جەستەیی لەلای پیاو تەنها (١٢٪) بەڵام لەلای ژنان زیاترە دەگاتە لە (٢٥٪) و توێژەرەوەکان ئاماژە بە ژمارەیەکی زۆر لەو ژنانە دەدەن ئەوانەی پارێزگاری لە ڕێکی لەش‌و لاریان دەکەن هەرچەندە ژیانێکی سروشتی و بەتەندروستی باش دەبەنە سەر بەڵام لە ڕاستیدا بەدەست نەزۆکی‌یەوە دەناڵێنن، و توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە کچ لەتەمەنی پێش سووڕی کەوتنە سەرخوێن یا سوڕی مانگانەدا و باڵای (پێنج پێ‌و سێ ئینج بێ) دەبێت کێشی بەلایەنی کەمەوە (٩٠) پاوەن یان ٤١ کگم) بێت، بۆ ئەوەی توانایی منداڵبوونی هەبێت و ئەو کچانەی کە تەمەنیان (٢٠) ساڵەو هەمان باڵایان هەیە بۆ ئەوەی بتوانن منداڵیان ببێت پێویستە کێشیان لە (١٠١٪ پاوەن یان ٤٦ کگم) زیاتر بێت بۆ ئەوەی کرداری هێلکەدانیان لەلا بەردەوام بێت.

توێژەرەوەکان تێبینی ئەوەیان کردووە ڕێژەیەکی دیار هەیە لەنێوان کێش‌و نەزۆکی‌دا بەشێوەیەك لە دەستدانی تەنها ٣ پاوەن دەبێتە هۆی مەترسی لەسەر بەپیتی ژنان بەبێ دەرکەوتنی هچ نیشانەیەك کە بەڵگە بێت بۆ کاریگەری لەسەر بەپیتی ژنان وەك تێکچونی ڕژێمی سوڕی مانگانەیان هتد..

توێژەرەوەکان پێیان وایە لاوازی لە ڕادەبەدەر قەڵەوی لەڕادەبەدەر دەبێتە هۆی دروست بوونی مەترسی لەسەر تەندروستی منداڵ بوون لەژیانداو ئەو ژنە لاوازانەی تەنها شیرەمەنی بێ چەوری‌و کاهوو و خواردەمەنی ئامادەکراو خۆراکی تایبەت بەرجیمەوە دەخۆن خۆیان ڕووبەڕووی مەترسی نەزۆکی دەکەنەوە، زاناکان ڕونیان کردەوە کە چەوری لەش لە ژناندا‌و ئەو هۆرمۆنی ئەندرۆجینە نێرینەییەی بە ڕێژەیەکی کەم لە لەشیان داهەیە دەگۆڕێت بۆ هۆرمۆنی ئیسترۆجینی مێیینەیی، و ئەم هۆرمۆنەش توانای فەرمان دانی هەیە لەسەر هۆرمۆنی لبتین کە لێ پرسراوە بەرامبەر بەڕێکخستنی ئارەزووی خواردن‌و کردارەکانی زیندەپاڵ ووزەو کاریگەری لەسەر کردارەکانی منداڵبوون هەیە، ئاماژە بەوە دەدەن کە سکپڕی سەرکەوتوو پێویستی بەنزیکەی ٥٠ هەزار کالۆری گەرمی هەیە و ئەگەر لەشی ئەم کالۆریە پێویستییەی نەبێت ئەوا دەماخ هۆرمۆنی لپنین کەمتر دەکاتەوەو توانایی منداڵبون ڕادەوەستێنێت‌و دوای دەخات.

زاناکان جەختیان لەسەر گرنگی ڕۆڵی خواردن کردۆتەوە لەسەر پارێزگاری کردنی تەندروستی منداڵبون و زیادە ڕەوی لە کێش‌و لاوازی زۆر کاریگەری خراپیان لەسەر فرمانەکانی (هێلکەدانەکان) لەژنان دا هەیەو دەبێتە هۆی ناڕێکی لە سوڕی مانگانەدا کە هۆیەکە لە هۆیەکانی پاراستنی دژەکانی ئەو کێشانەی کە لە کاتی سك پڕی‌دا ڕوودەدات.

Internet

# کورتە مێژوییەکی ڕواندنی ددان

منی فائق براخاس
پسپۆڕی بایۆلۆژی

زۆرێك لەخەڵکان لەو باوەڕەدان کە بابەتی ڕواندن یان چاندنی ددان لە تازەگەریەکانە، لەبەرئەوە بەترسەوە لێی دەڕوانن، لەوانەیە بە دواداچونی مێژوویی بۆ ئەم بابەتە هەر لە سەرەتاوە تاوەکو ئێستا زۆرێك لەو ترسە بڕەوێنێتەوە.

ووشەی ڕواندنی ددان واتای ئەوەیە کە لە ئێسکی شەویلگەدا ڕاگیرکەری کانزایی دادەنرێت، بۆ ئەوەی لە دواییدا ددانی دروستکراو هەڵبگرێت.

ووشەی ڕواندن لە جیاتی ووشەی چاندن بەکارهاتووە چونکە ئەمەی دوایی ئەوە دەگەیەنێت کە شتێك هەیە دەخرێتە ناو شەویلگەوەو وازی لێدەهێنرێت بۆ ئەوەی گەشە بکاتو لەبەشە دیارەکەی پوکدا سەر دەربێنێت.

لێکۆڵینەوەی مێژووی ڕواندنی ددان دەبێت بەشێوەیەك لێی بڕوانرێت کە کۆمەڵێك نیشانەو وێستگەی گرنگ لەسەر ڕێگەی پەرەسەندنی مێژوویی ئەم زانستەدا هەبێت، کە بە درێژایی چاخەکان ڕێنیشاندەری دروست بوونی ئەم ناوەڕۆکە زانستیە گرنگە بوون.

ئەم پەرەسەندنە لەسەردەمی فیرعەونە کۆنەکانەوە لە میسرو وولاتی فینیقیەکانو چین دا دەستی پێکردووەو دوای ئەوە لەسەرانسەری جیهاندا گەشەی سەندو بڵاوبویەوە. بەدرێژایی تێپەڕبونی کاتەکان هەر لەسەدەی ناوەڕاستەوە هەوڵ و کۆششی هەندێك لە زانایانی ئەم بوارەی بەخۆیەوە بینی، تاوەکو گەیشتنی بەسەدەی بیستەم کە پەرەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، ئەوەندەی پێ نەچوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا شۆڕشێکی زانستی هەڵگیرسا، کە ئەم زانستەی سەقامگیرترو بەهێزتر کردو وەك ڕێگە چارەیەك بۆ کێشەی نەخۆشی یەکانی لەدەستدانی ددان بەکاردێت.

### هەنگاوە یەکەمییەکان

هەر لە سەردەمی میسریە کۆنەکانەوە، بەتایبەتی لە سەردەمی خێزانی پاشایەتی یە دێرینەوەکانەوە (٤٦٠٠)ساڵ لەمەو پێش، بەجێهێنانە پزیشکی یەکان سەقامگیربوون. و (هیرو دوت)ی مێژونوسی یۆنانی بەناوبانگ لە مێژوەکەیدا ئەم قۆناغەی لە دواییدا بەو شێوەیە باس کردووە کە میسریە کۆنەکان هەموو جۆرە پسپۆڕێتیەکیان لە بواری پزیشکیدا هەبووەو هەر پزیشکێك تەنها جۆرە نەخۆشی یەکی چارەسەردەکرد، هەبوو تەنها

نەخۆشی چاوی چارەسەردەکردو هەندێکیان ددانو هەندێکی دیکەیان نەخۆشییە هەناوییەکان (هسی رع) کۆنترین پزیشکی ددان بووە کە لە سەر یەکێك لە لیستە تەختەیییەکان ناوی تۆمارکراوەو لە سەردەمی (زوسر)دا ژیاوەو بەگەورەترین چارەسازی ددان باس کراوە. هەروەها دیاریەکی تەختە دۆزراوەتەوە کە لە لایەن فیرعەون (ساهورا)وە بۆ پزیشکی خۆشەویست لە دەرونییەوە (نای انك) نێردراوە، و لە بنکە تەختەیەییەکەیدا بەخەتی هیروگلیفی لەسەری نوسراوە (من کور أنك) واتا پیاوی ددان. و لە پشکنینی پاشماوەی مۆمیاکراوەکانەوە ئەوە دەردەکەوێت کە ددان کێشان یەکێك بووە لەو رێگە چارەیانەی کە بۆ رزگاربونی نەخۆشەکان لەئازارەکەیان بەکارهاتووە. سەرەرای دۆزینەوەی چەند کونێك کە پزیشکە کۆنەکان لە رووپۆشی دەرەوەی ئێسکی شەویلگەدا هەڵیانکەندوە بۆ کەم کردنەوەی ئەو پەستانەی لە ئەنجامی کۆبونەوەی ژەنگ لەلکی ژێر خریێ کاندا پەیدا دەبێت. کۆمەڵێکی زۆر لە ئێسکی کەللەسەر دۆزراوەتەوە کە ئەم کونانەی تێدایەو دەگەرێنەوە بۆ سەردەمی خێزانی پاشایەتییە دێرینەکان، ئەمانەش لەو کۆمەڵەدان کە لە مۆزەخانەی زانکۆی هارڤاردی ئەمریکیدا دانراون. هەروەها کۆمەڵێکی دیکە لە مۆزەخانەی پاریسدا هەن کە مێژوویان دەگەرێتەوە بۆ ساڵەکانی (١٥٧٠-١٥٨٥) پێش زایین. کە چاڵی وای تێدایە دەگاتە رەگی ددانەکە بە قوڵی (٥) ملمو پانی (٢) ملم بە ئامێری هەڵکۆڵەری ورد هەڵکەنراون.

چەند لێکۆڵینەوەیەك لەسەر توێکڵی زەل (بردیات) کراوە وەك بەردیەی (ئەدوین سمیس)سەدەی (١٧) پێش زایین. کە لە کتێبخانەی زانکۆی لیبزگ پارێزراوە، ئەوەی دەرخستووە کە هەندێك نەشتەرگەری بۆ چارەسەرکردنی شکانی شەویلگەو لەجێچونی جومگەی شەویلگەو شکانی ئالۆزی شەویلگەی سەرەوەو ئێسکی لاجانگ و قلێش بردنی لێو کراوە.

بونی ژمارەیەکی زۆر لە نەخشی ئەو ئامێرانەی کە لەم نەشتەرگەریانەدا بەکارهاتوون لە سەر دیواری پەرستگاکاندا ئەم راستیانە دوویات دەکاتەوە.

دوو دۆزینەوەی گرنگ دەمەقاڵێیەکی زۆریان لەنێوان مێژوونوسو زانا میسریەکاندا وروژاند، یەکێکیان دۆزینەوەی جوتێك خرێی ددان بوو کە بەدوایکی ئاڵتونی بەیەکەوە بەسترابوون (٢٥٠٠ساڵ پ.ز) زاناکان ئەوەیان هەڵهێنجا کە ئەم بەستنەوەیە بۆ چارەسەری لەق بوونی ددانی ئەم نەخۆشە لە ماوەی ژیانیدابووە، ئەویش بە بەستنەوەی بەددانە بەهێزەکانی تەنیشتیەوە. لەکاتی دۆزینەوەی ئەم ددانانەدا لە ساڵی (١٩١٤) کە لە لایەن زانا (هیرمان جنکر) لە ژورێکی ناشتندا دۆزرایەوە، نیشتوی شێوە کلسی لەسەر ئەم ددانانەدا بینرا، ئەمەش بۆچونەکەی پێشو بەهێزتر دەکات.

دۆزینەوەکەی دی کە دەمەقاڵێی لەسەرکرا بەهۆی زانای میسریەکان (شفیق فرید) لە ساڵی (١٩٥٢) دابوو. کە لە چاڵەکانیدا لەنزیك قاهیرە سێ ددانی دۆزییەوە کە بە داوێکی ئاڵتونی بە یەکەوە بەسترابوونو مێژوویان بۆ سەردەمی خێزانی پاشایەتییە درێرینەکان دەگەڕایەوە.

بۆچونی تۆژەرەوەکان وابوو کە ئەم پێکهاتەیە بەنمونە سەرەتاییەکانی جێگرەوەی ددان دادەنرێت، ئەم پێکهاتەیە بوە جێگای تاوتوێ کردن چونکە پێکهاتبوو لە کەڵبەی لای راست کە لە سەر برەرە تەنیشتەکانی هەڵگیرابوو بەداوێکی ئاڵتونی لەرێرەوێکی هەڵکۆڵراودا کە بە ئامێری تایبەتی هەڵکەنرابوو بەیەکەوە بەسترابونەوە. ئەم ددانانە رەگی تەواویان هەبوو ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی کە دانانی ئەم پێکهاتوە لە شوێنی راستی خۆیدا بەبێ ئەوەی پەستان بخاتە سەر پوك لەم شوێنەدا ئاسان نەبێت. ئەو شیکردنەوەیەی بۆ ئەمەکرا ئەوەی دەگەیاند کە ئەم پێکهاتەیە دوای مردنی نەخۆشەکە دانرابێت بەپێی ئەو زانیاریانەی کە میسریە کۆنەکانی پێ ناسرابوو ئەویش وریاییان بوو بۆ ئەوەی لاشەی مردووەکانیان لە کاتی ناشتندا لە باشترین باردا بێت بۆ ئەوەی لە ژیانەکەی دیکەیاندا گیانیان بە بەردا بێتەوە.

پێکهاتەی دیکەی لەم جۆە لە شاری سەیدا لە لوبنان دۆزراوەتەوە کە مێژوەکەی بۆ سەدەی پێنجەمی پێش زایین دەگەرێتەوەو ئێستا لە مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس پارێزراوە، ئەویش بریتییە لە چەند پێکهاتەیەك کە بەدوای ئاڵتونی راگیرکراون. و یەکەی پردەکان گەیشتوەتە چوار یەکەی جێگیر بەهۆی دوکاکیلەی تەنیشت یەکەوە.

ئەوەش ئاشکرایە کە شارستانێتی میسریە کۆنەکان کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر شارستانێتی فینقیەکان هەبووە، ئەمەش لەتوانای (دانسازە فینقیەکاندا دەرکەوتوە کە توانیویانە پێکهاتەی هاوشێوەی ئەو پێکهاتانە دروست بکەن کە لە حەوزی نیلدا بە (٢٠٠٠) ساڵ پێش ئەمان دۆزراونەتەوە.

و لەکاتی شارستانێتی (مایا)دا کە مێژوویان بۆ (٢٥٠٠) ساڵ پێش زایین دەگەرێتەوەو لە دەرووبەری کەنداوی مەکسیك دا کە ئێستا بە کۆلۆمبیا ناسراوە بڵاوبووبونەوە، هەندێك کەللە سەری سەدەی نۆیەم دۆزرایەوە کە ناواخنی ددانەکانی پێشەوەیان لە جادو فەیرۆز دروست کرابوون. دۆزینەوەی بەشێك لە کەللەی سەر یەکێکە لەو دۆزینەوە گرنگانەی کە لە ناوچەی ئیکوادۆر دۆزراوەتەوەو لە مۆزەخانەی هندیە سورە ئەمریکییەکان لەشاری نیۆیۆرك پارێزراوە، و مارشاڵ لە ساڵی (١٩١٣)دا بەوشێوەیە باسی لێوەکردووە کە پارچەیەك لە شەویلگەی سەرەوە بێت بە

هەموو ددانەکانەوە بێجگە لە خرێی ژێری، و برەرەکانی پێشەوەی بەڕوپۆشێکی ئاڵتونی لەدیوی دەرەوە داپۆشراون، ئەوەش ئاشکرایە کە ئەم ددانانە لە جێگەی ددانە هەڵکێشراوەکان ڕوێنراون. و (برنارد وینبرج) کەیەکێکە لە بەناوبانگترین مێژوونوسەکانی زانستی پزیشکی ددانە، ئەو بۆچونەی هەبووە کە ئەم ددانە یەکەم نمونەی کرداری گواستنەوەی ددان لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دیکە بوبێت. ئەم لە لایەن (سمویل فاستلیشت)ی زانای بەناوبانگی پسپۆڕ لەبواری لێکۆڵینەوەی پزیشکی ددان لەپێش سەردەمی کۆلومبیەکانەوە ڕەتکرایەوە، لەبەر هۆیەکی زۆر ئاشکرا ئەویش دروستنەبوونی ئێسکە لە ئاستی شکانەکەداو وای دانا کە ئەم نەشتەرگەریە دوای مردن کرابێت بەپێی ئەو بیرو باوەڕە ئاینیانەی کە لە شارستانێتی میسریە کۆنەکاندا پەیڕەوکراوە.

و بەڵگەی بەهێز لەسەر ئەوە هەیە کە (مایا) کرداری ڕواندنی مادەی دروستکراوی نا ئەندامیان لە خەڵکانی زیندودا ئەنجام دابێت.

ویلسون بوبون و ژنەکەی لە چاڵە هەڵکەنراوەکانیاندا لە هندۆراس لە ساڵی _١٩٣١)دا، پارچەیەکیان لە شەویلگەی خواروی یەکێك لە (مایا)کان دۆزیەوە کە مێژووەکەی بۆ (٦٠٠) ساڵ دوای زایین دەگەڕێتەوە (لە مۆزەخانەی کەلتورو شوێنەوار لە زانکۆی هارفارد پارێزراوە) دوای لێکۆڵینەوەی بینیان کە سێ ددانی تێدایە کە لە سەدەف دروستکراون و لەچاڵایی ددانە هەلکیشراوەکاندا دانراون، چەند لیکۆلینەوەیەك بەتیشکی سینی (X-ray) لە ساڵی (١٩٧٠) دا ئەوەیان دەرخست کە چینیك لە ئیسکی بەیەکداچوو لە دەوری ددوان لە روینراوەکاندا هەیە کە وەك ئەوانەن ئیستا لەگەڵ دانانی شفرە کانزاییە روینراوەکاندا دادەنرین. ئەمەش بەیەکەم جۆری رواندنی ماددەی کانزایی ناو ئیسك دادەنریت کە دۆزرابیتەوە.

*سەردەمی نوێ:

لە ساڵی (١٨٠٩)دا (موجیلو) روینراویکی بێ تاجی لەزێر دروستکراوی لە دەرچەی تازە هەلکیشراویکدا دانا ئینجا لە دوای ساریژبونەوەی ئیسکەکانی دەوری تاجەکەی بۆ زیادکرد، سەرەرای ئەوەی کە نەخۆشەکە لە دواییدا روبەروی ئازار و هەوکردنی زۆر بوەوە، بەڵام ئەمە بەهەولە یەکەمینەکانی رواندنی ددان لەسەردەمی نویدا دادەنریت. ئەوەی لەدوای ئەم بەکارهات رەگەکانی لە قورقوشمی زبر دروستکرابوون کە چەند بزماریکیان لە بلاتینیۆم هەلگرتبوو، قاجیکیش لە بورسلین و لەشە بۆریەکەشی لەزیرو ئەیریدۆم دروستکرابوو.

لە ساڵی (١٩١٣)دا (جرینفیلد) تۆریکی تازە بابەتی دروستکرد لە دوو پارچە پیکهاتبوو کە لە ئالتونی عەیار (٢٤) دروستکرابوون و بەداویکی ئالتونی عەیار (٢٤) یش بەیەکەوە چەسپینرابوون. و بەشی دووەمی کە تاجەکەیە لەدوای ساریژبون بۆی زیاد دەکریت لەوبەشەدا کە رەگی کاکیلەکە دەنوینیت. ئەمە یەکەمین نەخشەی لەم جۆرە بوو کە لە دواییدا پەرەی سەند بۆ ئەوەی ببیتە ئەو روینراوە بۆشاییدارانەی کە لەم رۆژانەدا بەکاردین.

و لەساڵی (١٩٣٧) دا (ئەوم) داهینانیکی بۆ رواندنیکی کانزایی پیشکەش کرد کە بنکەیەکی بازنەیی و ملیکی لوس و داپۆشەریکی ساریژکەری هەبوو کە بۆ جیگیرکردنی تاقمی سەرەوە بەکاردیت بەهەمان ئەو ریگەیەی کە ئیستا پەیرەو دەکریت. ماوەو ریژەی سەرکەوتنی رواندنەکانی (ئۆم) تا ئیستا نەزانراون بەڵام بە دلنیاییەوە بواریکی بۆ ئەم جۆرە رواندنانە لە پەنجا ساڵی دواییدا واڵا کرد. سەرکەوتنەکان سنوردار بوون، ئەم روینراوانە لەشوینی خۆیاندا نەئەمانەوەو نەخۆشەکان لەماوەی چەند ساڵیکدا لە دەستیان دەدان، بەم شیوەیە مایەوە تا ئەو کاتەی ستروك لە زانکۆی هارڤارد لە ساڵی (١٩٣٨)دا یەکەم روینراوی دریژخایەنی دانا.

ستروك لە ساڵی (١٩٣٨) دا روینراویکی لە میتالیوم کردە ناوچاڵی ددانیکی تازە هەلکیشراوەوە، ئەم روینراوە سەریکی شیوە رەحەتی هەبوو کە تاجەکەی لەسەر راگیرکرابوو، بۆشایی نیوان دەرچەی هەلکیشراوەکەو روینراوە کانزاییەکەی بە ئیسك پرکردەوە. ئەم روینراوە لە شوینی خۆیدا لە باریکی جیگیرو باشدا مایەوە تاوەکو لە ساڵی (١٩٥٥)دا نەخۆشەکە بە رووداوی ئوتۆمبیل گیانی لەدەستدا.

ئەو پەرەسەندنەی کە لە سەدەی بیستەمدا رویدا چەند تەوەرەیەکی گرنگی گرتەوە، پەرەسەندنی مەزن لە مادە بەکارهینراوەکانی دروستکردنی ددانە روینراوەکاندا رویدا، هەروەها پەرەسەندنیکی هاوشیوەو یەکسان لە نەخشەسازی ئەم روینراوانەو بەکارهینانەکانیانو چەند جارە بەجیهینانیاندا رویدا، و لە ئاکامی ئەو پیشکەوتنە گەورەیەی تەکنەلۆژیا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بواری قوڵ بونەوەی زیاتر بۆ تیگەیشتنی بایۆلۆژی ئیسكو ئەندازەی ژیانیو زانستە تازەکانی دی کە ریخۆشکەربوون بۆ پەرەسەندنی رواندنی ددان رەخسا.

لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەوە، ژمارەیەکی زۆر لە کانزا بۆ دروستکردنی روینراوەکان تاقی کرانەوە وەك: زیرو قورقوشمو تیتانیۆمی رەق کە ژەنگ هەلناهینیت و داریژراوی کۆباڵتو مولبیدیۆم وتیتانیۆم. هەروەها مادەی دیکەی وەك پولیمرو کاربۆنی شوشەیی بەکارهات، ئەم مادانە لەسەرەتای دەرکەوتنیاندا هەندیك سەرکەوتنیان بە دەستهینا، بەڵام ئەوەندەی پینەچوو کە وایان لیهات پیویست بەوەبکات پزیشکەکانی رواندنی ددان روو لە بەکارهینانی وەربگیرن.

Internet

# کێشەی قەڵەوی منداڵان

جمیل حەمە

گرنگی ئەم مەسەلەیە لە منداڵاندا بە ئەندازەی زیادەی کێش و قەڵەوی‌یە لە گەورەکاندا. نەبونی هاوسەنگی لەنێوان خۆراکی بەکاربراو چالاکی جەستەییدا هۆی قەڵەوی‌یە لە زۆربەی منداڵاندا قەڵەوی لە هەندێك خێزاندا باوەو بەدەگمەن ڕێدەکەوێت تێکچونێکی جینی یا هۆرمۆنی بنەڕەتی ببێتە هۆی قەڵەوی، بەرگرتن لە قەڵەوی زۆر گرنگترو ئاسان ترە لە بەکارهێنانی داودەرمانی قەڵەوی. گونجاندنی چالاکی‌یەکانی جەستەیی وەکو پاسکیل سواری‌و بەپێ ڕۆیشتن (پیاسەکردن)) بەشێوەیەکی بەردەوام لەبەرنامەی ڕۆژانەدا زیاتر لە چالاکیە وەرزشیەکانی دی بۆ مرۆڤ لەبارترە. ڕژێمێکی خۆراکی پڕ چەوری لە ماوەی گەشەی مناڵیدا بەهیچ شێوەیەك دروست نی‌یەو دەبێت منداڵان هانبدرێن، کێشێکی گونجاو بەدەست بهێنن تابتوانن بە ڕێك‌و پێکی گەشە بکەن. ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) قەڵەوی وەك دیاردەیەکی جیهانی ڕاگەیاند پزیشکەکان بۆ چارەسەرکردنی قەڵەوی کارێکی زۆریان لە دەست نایەت‌و ئەو بەرنامەیەش کە لە قوتابخانەکان یا کلینیکە تایبەتیەکانی قەڵەوی ئەنجام دەدرێت سەرکەوتنێکی زۆرباشیان بەدەست نەهێناوە.

منداڵانی قەڵەو، بەشێوەیەکی سروشتی لە ڕوی جەستەیی‌و کۆمەڵایەتی‌یەوە توشی کێشەی زۆر دەبن، ئەوان لە قوتابخانەدا دەکەونە بەر گاڵتەو گەپ‌و ئازاری قوتابیان هاوڕێیەتی کردنی کەسانی دیکەیان لا سەخت دەبێت، خەفەت و خەمباری قەڵەوییان کاریگەری لەسەر ئاستی سەرکەوتنیان لە وانەو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی‌یاندا دەبێت. ئەم کۆمەڵە کێشانەش زۆر جار لەوانەیە تا تەمەنی گەورەیی بەردەوام بن.

منداڵانی قەڵەو بەشێوەیەکی سروشتی تەمەن گەورەیەکی قەڵەویان لێ دەردەچێت بەتایبەتی ئەگەر لەخێزانەکانیاندا توانایەکی لەبەرچاویان بۆ قەڵەو بوون هەبێت. کەسانی قەڵەو بەشێوەیەکی سروشتی لەبەردەم نەخۆشیەکانی وەکو ، وەستاندنی دڵ، پەستانی خوێنی بەرز، هەوکرنی جومگەکان تەنگە نەفەس، شەکرەو تەنانەت هەندێك نەخۆشی شێرپەنجەشدان بەهەمان ئەندازەی کە قەڵەوی لە منداڵاندا زیاد دەکات، کەسانی بەتەمەنی دووچار بوش بەشەکرە زیاد دەکەن.

گرنگترین هۆکاری زیادبوونی ژمارەی کەسانی قەلەو، گۆرانکاری لە شیوازی ژیانیانە. منداڵان لە جیاتی سەرقالبونیان بە چالاکی جەستەیی‌یەوە یاری بە کۆمپیوتەر دەکەن یاخود سەیری تەلەفزیۆن دەکەن. لە جیاتی ئەوەی بەپێ یاخود بە پاسکیل بۆ قوتابخانە بەریکەون، سود لە ئوتۆمبیل وەردەگرن. خۆراکە پر چەوری‌و پر کالۆرییەکان دەخۆن، لەبەر ئەم هۆکارانە چارەسەرکردنی زیادی کیش‌و قەلەوی لەلایەن پزیشکەکانەوە بۆ خۆی دەبیتە کیشە. شیوازی ژیان‌و ژینگە بە سەختی توانای گۆرینیان هەیە. فیرکاری منداڵان بۆ ریکو پیك خواردنی ژەمەکان‌و هاندانیان بۆ ئەنجامدانی چالاکیە جەستەییەکان بۆ ریگری لەم کیشانە گرنگیەکی زۆری هەیە. رژیمی بەردەوام بۆ ئەو منداڵانەی کە لە کاتی گەشەدان باش نی‌یە، مندالیکی برسیش مندالیکی غەمگینە. باشتر وایە منداڵان فیربکرین کە سود لەمادە خۆراکی‌یە بێ زیانەکان وەرگرن. خواردنی میوەو سەوزەمەنی بە ئەندازەی حەزلیکردن مۆلەتیان پیبدریت، لە کاتیکدا کە دەبیت لە خواردنە پر کالۆری‌و، سورکراوەکان‌و ، شیرینی‌و شوکولاتەکان خۆ بەدووربگرن، کەم بونەوەی چالاکی بە بێ جموجوڵ وەکو یارییە کۆمپیوتەرییەکان‌و تەماشای تەلەفزیۆن خراپە بەپیچەوانەوە هاندانی منداڵان بۆ ئەنجام دانی چالاکیە وەرزشی‌یەکان سوودبەخشە ئەنجام دانی ئەم کردەوانە لەگەڵ چالاکییە وەرزشی‌یەکانی رۆژانە یارمەتی هاوسەنگی‌و کەم بونەوەی کیشی دەدات. بەکارهینانی حەپی کەمکردنەوەی ئیشتهاو حەز لە خوراك کردن، کاریکی باش نیەو خراپە.

### پشتیوانی دایك‌و باوك

بەدەست هینانی کیشی خوازراو، کاتیك زیاتر سەرکەوتو دەبیت کە بەرنامەی رژیمی خۆراکی لەلایەن دایك‌و باوکەوە کۆنترۆل بکریت، دایك وباوك دەتوانن رەفتاری خیزان‌و ریبەرە خۆراکیەکان بگۆرن‌و ئەنجام دانی چالاکیەکانی جەستەیی، جموجول‌و وەرزشی منداڵان بخەنە ژیر چاودیری خۆیانەوە.

قوتابخانەو بەرنامەکانی دژە قەلەوی: وا دیتە پیش چاو قوتابخانە شوینیکی گونجاو بیت بۆ روبەرووبونەوەی قەلەوی باو لە نیوان منداڵاندا، منداڵان چەندین کاتژمیری ژیانی خۆیان لە قوتابخانە بەسەر دەبەن‌و بەتوندی لە ژیر کاریگەری مامۆستایانی خۆیاندان. بەرنامەیەکی پەروەردەیی تەندروستی لە قوتابخانەدا لەگەڵ پیداویستیەکانی چالاکی جەستەیی لەژیر چاودیری راهینەران لە قوتابخانە دەبیت ریگەیەکی کاریگەربیت بۆ دەست بەسەراگرتنی کیشی زیادە، بەڵام بەداخەوە لەم روەوە سەرکەوتنیکی باش بەدەست نەهاتووە. بەرنامە تایبەتیەکانی‌پەروەردەی تەندروستی پیویستی بە هەولدانیکی زۆرە لە فیرکردنی مامۆستایان‌و بەرپرسانی دیکە، کاتی زۆر و گونجاو لەپاڵ بەرنامەکانی دیکەی قوتابخانەدا هەیە. بەڵام لە هەمووی ئەوانەی کە ئەنجام دەدریت، تەنها زیادبونی زانیاری سەبارەت بە رژیم‌و قەلەوی، خوەکانی خواردن...هتد. بەدەست هاتووەو ئاکامیکی کردەیی‌و بەسود دەست نەکەوتووە.

سەرچاوە: همشهری
ژمارە ٢٧٤١

# دوو دڵی دەروونی

## لە تەمەنی هەرزەکاریدا

## هەرزەکار.. پێویستی بەڕێنمایی‌کردن هەیە

بەسۆز سەعید محمود
وەزارەتی پەروەردە

هەرزەکار .. ئەو گەنجەیە کە تەمەنی لە خواربیست ساڵی‌یەوەیە یان ئەو کچەی لە خوار بیست ساڵەوەیە. گوناهی هەموومان ئەوەیە کە سەیری هەرزەکاری دەکەین بەوەی کە ماوەیەکی نەخۆشی‌یە.. و واسەیری ناکەین کە قۆناغێکی سروشتی‌یەو هەریەك لە ئێمە بەو قۆناغەدا ڕۆیشتوین. من دەڵێم هەرزەکار مرۆڤێکەو دەگەڕێت بەدوای پێ گەیشتنداو کاری ئێمەش ئەوەیە ڕێگای بۆ ڕوون بکەینەوەو ڕێنمایی بکەین. هەرزەکار پێویستی بەڕێنمایی ئێمەیەو هیواشی بۆ دەخوازێت. بەمەرجێك وەکو هاوڕێیەك پێشکەشی بکەین. ناتوانم ئەو ڕووداوە سادەیە لە ماناقوڵەکەی دابڕم، کچێك تەمەنی پانزدەساڵ بوو لەگەڵ دایکیدا هاتن بۆ لێنۆڕگەکەم. و من واڕاهاتبووم کە نەخۆشەکە لەگەڵ دایکی و باوکی‌دا ببینم. بەڵام کچەکە داوای کرد بەتەنها بێتە ژورەوە و دایکی لەگەڵی‌دا نەبێت بۆ ئەوەی قسەم بۆ بکات بێ ئەوەی دایکی گوێی لی بیت. لەو چرکەیەدا هەستم بە ڕاستی‌یە زانستی‌و مرۆڤایەتی‌یەکان کرد. ئەویش ئەوەیە گەنجێك لەخوار تەمەنی (٢٠) سالی‌یەوە یان کچێك لە خوار تەمەنی بیست سالی‌یەوە پیویستی بەراستی‌یەکی گرنگ و سەرەکی هەیە کە کۆمەڵ باوەر بەوە بکات گەنجیکەو پیگەیشتووە مافی خۆیەتی کە رای هەبیت. هەریەکەشیان بوونیکی تایبەتی خۆی هەیە. هەریەکەشیان هەست بەو پێ زانینە قولە دەکەن بەرامبەر هەرچ کەسیك کەبروا بکات کە هەریەکەیان کەسیتی‌یەکی سەربەخۆی هەیە. مرۆڤی خوار تەمەن بیست ساڵ پیویستی‌یەکی سەرەکی بەریزلینان هەیە.

لەکاتیکدا مرۆڤیکی خوار بیست ساڵ کەروودەکاتە شوینیك بۆ کرینی شتیك واهەست دەکات ئەوەی کە دیت بەدەمیەوە دەبیت ریزی لی بگریت. ئەمەش سەرنجی خاوەن

كۆگاكانی ڕاكێشاوە. ئەوان ڕێزی زۆری لێ دەنێن هەوڵی ئەوە دەدەن كە زیاتر بەدەمیەوە بچن و هەموو هۆكارێك بەكاردەهێنن بۆ ئەوەی گەنجەكە باوەڕیان پێ بكات. كە شت و مەكەكانیان زۆر باشە بۆ ئەو گەنجە و بەتەنها بۆ ئەویش دروست كراوە. لەكاتێكدا گەنجێك لە خوار تەمەنی بیست ساڵییەوە سەرقاڵی وەرگرتنە لەزانكۆ وای پێ باشە ئەو فەرمانبەرەی كە ئیشەكانی بۆ دەكات هەندێك ووشەی هاندەری پێبڵێت. هەندێك لە زانكۆكانی ئەمەریكا سەرنجی ئەوەیان داوە لەبەر ئەوە فەرمانبەری پێشوازی كردنی وایان هەڵبژاردوە كە لەو كەسانەبن كە توانای زەردەخەنەیەكی باوەڕ بەخۆبونیان هەبێت. لەكاتێكدا مرۆڤێكی خوار بیست ساڵ سەردانی پزیشكی دەروونی دەكات بۆ بەرەنگاری كردنی ئەوشەڕانەی كە لە نێوان ئەمو دایكی و باوكی دایە هەوڵی ئەوە دەدات بەتەنها بچێتە ژوورێ بۆلای پزیشكەكە. لەترسی ئەوەی كە دایكی یان باوكی نەك پێش ئەم بچنە ژوورێ بۆ لای پزیشكەكە چونكە لەو بڕوایەدایە ئەگەر ئەمە ڕووبدات بەواتای ئەوەیە كە پزیشكەكە بەم دەڵێت تۆ هەڵەی.

باوكەكە تاوانباری دەكات لەبەردەم پزیشكەكەدا، پزیشكەكەش پشتی باوكەكە دەگرێت دژی ئەم. پزیشكەكەو باوكی لە گەورەكانن، و گەورەكان بە بەردەوامی بەرەنگاری بچووكەكان دەبنەوە، لە بەرئەوە كوڕەكە وای پێ باشە یەكەم جار بەرگری لەخۆی بكات...

لەكاتێكدا كە كچێكی تەمەن پانزدە ساڵە كەهاتە ژوورێ بەتەنها، دەستی كرد بەقسە كردن و هێرش كردنە سەر دایكی و باوكی گەورەكان بەگشتی، ئەو گەورانەی كە بەهیچ جۆرێك هیچ بوارێك بۆ گەنجەكان ناهێڵنەوەو، هەوڵی ئەوە دەدات كە قەناعەت بەخزمو كەس و كاری بكات كە هەقی خۆیەتی وەكو كچێكی خوار تەمەن بیست ساڵ هاوڕێی هەبێت و بچێت بۆیانەی وەرزشی لەكاتی پشووی هەفتەدا بەڵام باوكەكە ڕازی نابێت و دایكەكەش بە بەردەوامی گاڵتە بەم نەوە تازانەی كچ دەكات، ئەم نەوانەكە جیاوازی لە نێوان ئیش یاری‌دا ناكەن وا دەزانن ژیان هەمووی یارییە، بەكچەكەم ووت من دەمەوێت بە تەنها دایكت ببینم دایكەكە هاتە ژوورێ لێم پرسی كچەكەت چییەتی بەبێ ئەوەی یەك پیتی پی بڵێم لەوەی كە كچەكەی پێی وتووم.

دایكەكە ووتی: من هەست بەدوودڵییەكی زۆردەكەم لە كچەكەم بەدەست شەرمەوە دەناڵێنێت و ناتوانێت تێكەڵی كۆمەڵ بێت. من و باوكی بەهەموو ڕێگەیەك هەوڵی ئەوە دەدەین بەرەو پێشەوە بڕوات و هاوڕێی هەبێت و بچێت بۆیانەی وەرزشی .. بەڵام كچەكەم ڕازی نابێت، ئەو ئەوەی پێ باشە لە ژوورەكەی خۆی بەبێ دەنگی دابنیشێت ئێمەش زۆر دەترسین بەهۆی ئەم گۆشە گیرییەوە تووشی دارمانی دەماری ببێت گومان لەوەدا نییە كە ئەم كارە بۆ من زۆر سەرسوڕهێنەر بوو تەنانەت وای لێ كردم كە بڕوانەكەم و لای خۆمەوە لایەكیانمانم بە درۆزن زانی.. یان دایكەكە درۆدەكات یان كچەكە. من ئەوە دەزانم هەرچ تەنگو چەڵەمەیەك لەهەر خێزانێك دا ڕوودەدات هەرەیەكێك لەئەندامانی خێزانەكە لە گۆشەیەكی جیاوازەوە دەیبینێت و بەڕێگەیەكی جیاواز باسی دەكات. بەڵام وا باوەڕم نەكرد كە دایك و كچەكەی بارێكی ناكۆكی بەم پلەیە نزیك بن لەیەكەوە. بەردەوام بووم لەسەر بینینی كچەكەو دایكەكەی بۆ ماوەی چەند مانگێك لەماوەی ئەوەدا بۆم دەركەوت كە كچەكە نانالێنێت بە دەست ئەوەی كە خێزانەكەی ڕێگەی لێ دەگرن لە هەندێك شتدا.. بەڵام لە هەمان كاتدا دایكەكەو باوكەكە جەخت لەسەر ئەوە دەكەن كە گوایە ئەمان بە بەردەوامی حەز دەكەن كچەكەیان ئەوشتانە بكات بەڵام ڕازی نابێت. و بۆم ڕوون بوەوە كە هیچ كەسێك لەخێزانەكەدا درۆزن نییە.. بەڵام بە بەردەوامی ئەوە لە نێوان هەرزەكارەكاندا هەیە كە باوەڕیان وایە ڕقێكی شاراوە هەیە لەلای دایك و باوكیان. بۆم دەركەوت كە ئەو هەستەی هەمە ڕاستە كاتێك كە زیاتر لە خێزانێكم دی كە چەند هەرزەكارێكیان هەبوو هەریەكەیان كێشەكەی خۆی بەشێوەیەك باس دەكات زۆر پێچەوانەی باس كردنی

خیزانەکەیەتی. زۆر جار هەرزەکار دەست دەکات بەخۆ رزگارکردن لە هاوڕێ کۆنەکانیو دەست دەکات بەهەڵبژاردنی هاوڕێی تازە..و جیهانیکی نوێ بنیاد دەنیت، ئەم جۆرە رەفتارانە جەخت لەوە دەکەن کە هەرزەکارەکە لە ژیانیکی دوودڵیو دەمارگیری زۆردا دەژی. ئەو لە زۆربەی کاتەکان دا پیویستی بەهاوریێتی دایكو باوکی هەیە. و لە هەمان کات دا ئەو هەست بەوە دەکات کە خیزانەکەی سەربەستی نادەنێو هەستیکی لا دروست دەبیت کە جەخت لەسەرئەوە دەکات کە ئەرکەکانی لە مافەکانی زۆرترە، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچ مرۆڤیکی بابەتی دەتوانیت بلیت خیزانە ئاساییەکان هەولی ئەوە دەدەن کە دەرفەتیکی باش لەبەردەم کورەکەیاندا دروست بکەن بۆ ئەوەی هەستیو سەربەستییەکەی دەربڕیت، دایکان و باوکان داوایان لێ دەکریت کە رینمای رۆڵەکانیان بکەن لە تەمەنی هەرزەکاریدا چی راستە چی هەڵەیە. دەبیت دایکانو باوکان رەچاوی ئەو رینماییانە بکەن بۆ کچەکەیان یان کورەکەیان کە بەرەو رەفتاری گونجاویان دەبات، نابیت لەبەر ئەوەی باوکان دەیانەویت کۆنترۆڵی هەرزەکارەکە بکەن چونکە چاك دەزانن هەرزەکارەکە ئەزموونی کەمە. هەرزەکارەکەش لەهەمان کات دا ئەو رینمای کردنە بەکۆنترۆڵ کردنی تی دەگات هەرچەندە ئەو رینماییەش پیوست بیت لەوکاتەدا. هەندیك باوکان دەکەونە هەڵەوە بەوەی کە پێدادەگرن لەسەر هەندیك شتو لە هەندیك شتی دیکەدا ئاسان کاری دەکەن.

بەبێ هیچ لیك دانەوەیەك ئابەوشیوەیە گەنجەکە شتی ئەوتۆ دەدۆزیتەوە کە دایكو باوك بە ناماقوڵ لەرینماییەکانیان تاوانبار بکات.

ئیمە دەبیت واتەماشای گەنجی خوار بیست ساڵ بکەین کە مرۆڤن و لایەنی بەهیزیان هەیەو لایەنی بێ هیزیشیان لە هەمان کاتدا هەیە. بەم شیوە سەیرکردنە مرۆڤیایەتییە ئەوەمان بۆ مسۆگەر دەکات کە هەرزەکار مرۆڤیکە بەدەست دووراستییەوە دەناڵینیت کە هەرەیەکەیان لەوی دیان جیاوازە.

راستی یەکەم: کە هەرزەکار هەست بەگرنگی پاڵپشتبوونی دایکیو باوکی دەکات..

راستی دووەم ئەوەیە: باوەرنەبوونی بەخۆی وەکو مرۆڤیك کەپێ گەیشتووبیت لەگەڵ ئەو حەزە زۆرەی کە هەیەتی بۆ سەربەخۆبوون رزگار بوونی لە گەورەکانی.

لە روانگەی منەوە گەورەکان واتە تەماشای منداڵەکان دەکەن لەسەر ئەو بناغەیەی کەپشت بەدایكو باویکان بەتەواوی دەبەستن. منداڵە کورەکە کە دەترسیت رادەکاتە باوەشی باوکییەوە. و کچەکەش داوای پاریزگاری کردن لەدایکی دەکات کە تووشی تەنگو چەڵەمەیەك دەبیت. بەڵام منداڵیك کە دەکەویتە سەر زەوی داوای دەستی دایکی یان باوکی دەکات بۆ هەڵساندنەوەی لەبەرئەوە زۆر گونجاوە کە منداڵەکە داوای یارمەتی لەدایكو باوکی بکات. هەروەها گونجاوە منداڵ گوێ رایەڵی فەرمانەکانی دایكو باوکی بیت بۆروون کردنەوەی ئەو دابو نەریتو رەنگو رەفتارانەی کە پیویستە بیکات. ئەوە روونادات کە منداڵەکە گفتو گۆیان بەرەنگاری بوونی دایكو باوکی بکات تەنها لە هەندیك شتی بچووك دا نەبیت وەکو سووربوونی منداڵەکە لەسەر کرینی یارییەك

یان هەڵبژاردنی جلو بەرگی لەکاتی چوونە دەرەوەدا. بەڵام لەگەڵ دەست پێ کردنی تەمەنی هەرزەکاریدا ئیمەی دایكو باوك تووشی سەرسورمان دەبین بەوەی کە داواکاری رۆژانەی هەرزەکارکان زیاد دەکات چونکە مرۆڤیکی سەربەخۆ و شکۆی هەیە شایانی ئەوەیە سەربەخۆی ئەو هەقەی یاوەتیو ریزلینانی پیرۆزەو بریاردان لەسەر هەڵبژاردنی داهاتووی ژیانی ئەم سەرسورمانە هەموو رۆژیك هەموو چرکەیەك پیشکەشمانی دەکات بەبێ ئەوەی پاشگەزبیتەوە لێی. ئەو مرۆڤەی کە تەمەنی لەخوار بیست سالیەوە سورە لەسەر سەربەستیو سەربەرزیو مامەلەیەکی وا لەگەڵ دایکیو باوکیدا دەکات هەروەکو مامەلەی بزوتنەوە شۆرش گیرییەکان بەرگرییەکان دژی دەولەتە داگیرکەرەکان یان ئیمپریالیزمیەکان ئەو گەنجە گفتو گۆ دەکات و دانوسان دەکات لە دووبەرەوە شەردەکات. بەرەی یەکەم ناجیگیری

بـروا کـردن بەخۆیـەو دوودلـی و تـرس کـە هـەناوی دەتـەنیت دەربارەی سەربەسـتی و بـەرەی دووەم دژی ئیمەی گەورەیە.
دانوسـانمان لەگـەلدا دەکات و لەهەمان کـاتدا شـەرمان لەگـەلدا دەکـات و ئەگـەروا پیویستی کرد داوای سـەربەخۆیی دەکـات. و ئەگـەر ئیمـەی گـەورە بـەکتوپری ئـەم سـەربەخۆییەمان دایـە تیبینـی ئـەوە دەکـەین کـە رەتـی دەکاتـەوە لـە بەرئـەوەی (قەدەغەیـە) نـەك (پچریـنراو) بیـت. ئـەو واتـا (هـەرزە کارەکـە) ئـەوە بەباشـتر دەزانیت کە سەربەخۆییەکەیمان لی بسـەنیت.و ئەوە بەباشتر دەزانیت کە پالەوانیکی شەری رزگارکاراوی دیاری کراوبیت نـەك سـەبەرخۆی بدریتـێ بـەبێ ئـەوەی لـەوەو پـیش ئاگـادار کرابیـت. و لـەکاتیکدا کـە بـەکتوپری سـەربەخۆی دەدەینـێ دەست دەکـات بـە تـرس و پرسـیار دەکـات بـۆ یارمـەتی دان واخۆی لەبـەرچاومان واپیشـان دەدات کـە منداليکـی تەمـەن (١٠) سالە، و سروشتییە ئیمە پـێی بلیین (تـۆ پیویسـتیت بەیارمەتی ئیمە هەیە). و لە لەهەمان کاتدا سروشتییە ئەو بەوە رازی نەبیت و بەتوندی وەلاممان بداتـەوە کـە ئیمـە وای پێ دەلین.

و لەسەر دایك پیویستە تیبینی ئەوەبکات کە کورەکەی لە تەمەنی (١٥) سالیدا پشت بەم دەبەستیت بۆ ئامـادەکردنی خواردن وجل شتن. لەگەل ئەوەی کە کوری (١٥) سال سورە لەسەر ئەوەی کە دەتوانیت پشـت بـەخۆی ببسـەتیت. و لـە هەمان کاتدا کچیکی (١٥) سالیش، مرۆڤی خواربیست سال وا دەزانیت دەبیت هەموو لە خزمەتی حەزەکان و سەربەخۆی ئەودابن. و ئەمـەش ئـەوە دەردەخـات کـە هەرزەکارەکـە لـەچ دوودلییەکی گەورەدا دەژی. ئەودوو دلیە لە نیوان جێبەجێ کردنی سەربەخۆی و لە نیوان حەزەکانی بۆ ئەوەی کە دایك و بـاوکی وەکـو منـدال سـەیری دەکـەن. لەوانەیـە گـەورەکان سـەریان سـور بمینیـت لەمـە. لەوانەیـە یـەکیکتان برۆکـانی بەرزبکاتـەوە وەك سـەر سـورمان و واقورمـان. بـەلام بۆچـی هەریەکەمان هـەولی ئـەوە نـادەین ئـەوەمان بیر بکەویتـەوە کـە هەرزەکار بووین هەمان هەستمان هەبووە، مرۆڤی خواربیست سال هەسـتیکی قولـی هەیـە کـە پیویسـتە کاریگەرییـەکی لەبەرچاوی هەبیت لە کۆمەلگادا. مرۆڤی خوار بیست سال بەچاکەکان و خراپەکانی خۆی رازی نابیت وەکو منداليك کە رازی دەبیت، مرۆڤی خواربیست سال بەهەموو توانايەکيەوە هەولی ئەوە دەدات رای چوار دەوری بزانیت بەرامبەر رەفتارە باشـەکان و خراپـەکانی. ئـەو دەیـەویت نمونـەی بیـت دەرکەوتوو، گەشاوە، حەزبەوە دەکات کە هـەموو بزانـن کـە سـەرنج راکیشـەو زیرەکـەوە چـەند بەهرەمـەندی و کارامـەیی دەزانیت. بەکورتییەکەی ئەو دەیەویت لەیـەك کـاتدا بگاتـە چەند لووتکەیەك. ئەو بەوەرازی نابیت کە گەورەکان دەیلین کە ژیان لەسەرەتاوە واهاتووە کە مرۆڤ لەیەك بەهرەدا یان لەیەك سەرکەوتندا سەرکەوتوو دەبیت و هەموو مرۆڤیك ئەو بەهرەو خۆبەخشییەی پیشکەش بەخەلك بکات و هەریـەك لـە ئیمە بێ هەلە نییە. بەلام هـەرزەکار دەیـەویت بـێ هەلـەبیت. هەریەکیك لـەوان هەست دەکات کە مرۆڤیکـی نموونەییـەو چـەند ئامـانجیکی نموونـەی و بـەرز کاریگـەری هەیـە ئـەو دەیەویت وا خۆی ببینیتـەوە کە توانای ئەوەی هەیـە ببیتـە مرۆڤیکی نموونـەیی لەبەرئەوە ئیمە مرۆڤیکی خـوار بیست سال دەبینین واهەست دەکات کە هەموو جیهان دەوری داوەو زۆرشت دەزانیت، بەلام لەراستیدا زۆر شت نازانیت. ئەو بە بەردەوامی واخۆی دەبینیتەوە کە هەستەکانی لەدایك دەبن و. هەستی تازە تییدایە سەر هەلدەدا. و ئەم هەستانە دەرناکەون تەنها بە گفتوگۆکردن نەبیت. هەرزەکار واخۆی دەبینیتەوە کە گەلیك گۆرانی جەستەی گـەورەی بەسـەردا دیت و لەزۆربـەی کـاتدا چـاوی یـان لووتـی یـان (زیبکـەکانی) دەم و چـاوی بـە گەورەیی و دیار دینـە بـەرچاوی. لەهـەموو مرۆڤیکـی تەمـەن خواربیسـت سـالدا وەك ووزەیـەکی سیکسـی بـەهیز دەردەکـەویت. کـەخۆی ئەمانـەی بـە دل نیـەو دەیـەویت کۆنترۆلی ئەم ووزە سیکسییە بکات بەلام لەبـەر ئـەوەی لـە خـودی خۆیـدا تەنـها لـە خەفـەت زیـاتر هیـچ شـتیکی دی نابینیتـەوە لەبـەر ئەوە سەرناکەویت لە کۆنترۆل کردنی ئـەو ووزە لیشاوە حەز دەکات کە بەکردار ئەو وزە زۆر جێبەجێ بکـات بـەلام لەهـەمان کـاتدا نـاتوانیت ریـرەوی ئـەم ووزەیـە کۆنترۆل بکات، پرسیاریك لـەدلی هەرزەکارەکەدایـە ئـەویش ئەوەیـە ((چـی بکـەم هـەتا کەسـیك لـە توخمەکـەی دی بمدۆزیتـەوە)) مرۆڤـی خـوار بیسـت سـال لـە خـەيالدا نوقـم دەبیت. خەوبەوەوە دەبینیت کە دەتوانیت جوانترین قسـەو ریکوپیکترین رەوشت بنوینیت بەلام لەکاتیکدا کە رووبەرووی راسـتی دەبیتـەوە دەشـلەژیت. ئـەوەم لـەیادە لـە تەمـەنی هـەرزەکاریمدا بـۆ یەکـەم جـار بـوو ویسـتم دەسـتی کچـە هاورییەکەم بگرم زۆر شەرمم کرد. لەگەل ئەوەی کە من هەموو شـەویك بـە خـەيال باوەشـم پیدادەکرد. ئەوەشـم لـەیادە بـۆ ماوەی نیوکاتژمیر دانیشتم هەولی ئەوەم دەدا ئەو و وشانە بدۆزمـەوە بیلیـم کـە بـەزماندا دیت بـۆ بەسـەربردنی کـاتی چاوپیکەوتنەکـەمان بـەلام ئـەو وشـانەم نەدۆزییـەوە تەنـها

پرسیار کردن نەبێت لە تەندروستی خۆی و هەواڵی خێزانەکەی.

ئەو دوودڵییەی کە هاوڕییەتی هەرزەکاردەکات دوودڵییەکی زۆر گەورەو قورسە. و هیچ کەسێك نیە بتوانێت بڵێت ئەو ماوەیە دەروات بەبێ دوودڵیەکی گەورە.

دوودڵی لەوماوەیەدا هی ئەوەیە هەرزەکارەکە دەترسێت لەوەی توانای ئەوەی نەبێت کامڵ ببێت. لەناخیدا داوای دایك و باوکی دەکات بۆ ئەوەی زیاتر چاودێری بکەن و لە هەمان کاتیشدا هەر لەناخیدا داوای سەربەخۆی دەکات.

دوو دڵییەکەی بەگڵەی دەشاریتەوەو بە بەهۆدیارەو بە بەردەوامی هەرزەکار دەڵێت ((خێزانەکەم سەربەستی تەواوم ناداتێ) هەرزەکار نایەوێت بڵێت من دەترسم لەوەی کە کۆمەڵ دانم پێدا نەنێت وەکو مرۆڤێکی پێگەیشتوو. و نایەوێت بڵێت من دەناڵێنم بەدەست شەرم کردن لەوەی کە بەشداری کۆمەڵ بکەم. زۆرگرانە بۆ هەموو مرۆڤێك خۆی تاوانبار بکات لەبەرئەوە هەرزەکار گەورەکان تاوانبار دەکەن، و هەمیشە گەورەکان تاوانبار دەکەن، و هەولی ئەوە دەدەن هەندێك داواکاری وایان هەبێت کە گەورەکان رازی نەبن پێی. وەك ئەوەی کە کچەکە بیەوێت لە دەرەوەی ماڵەکەی بەشەو کات بەسەر بەرێت یا هەرزەکار ئۆتۆمبیلی خێزانەکە لێبخورێت.

و لە کاتێکدا کە دایك و باوکەکە رازی نابن ئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە هەرزەکارەکە چۆن شتێك بدۆزێتەوە ئەو شۆرشەی دژی دایك و باوکی پێ بەرپا نەکات دژی یان؟ من بەدایکان و باوکان دەڵێم پێویستە ئەوە بزانن کە ئەم شۆرشە زۆر جار بە بێ هۆیە تەنیا زیادە رەوییە لەبەرئەوە پێویستە دایکان و باوکان سووربن لەسەر هەلوێستیان و زۆر پێویستە سوربن لەسەر هەلسوکەوتە هاوسەنگەکانیان بەبێ ئەوەی دایکان و باوکان بکەونە ناو گێژاوی دوودڵی و پەرتەوازەییەوە. و پرسیار: ئایا ئیمە هاوچەرخین یا دواکەوتوین دەبێت دایکان و باوکان ئەو راستیە بزانن کە هەرزەکار پێویستی بەرێنمایی دایکی و باوکی هەیە. لێنۆرگە دەروونیەکان شایەتی لەسەر ئەوە دەدەن کە هەرزەکارەکە دەڵێت ((خەوم بەوەوە دەدی کە باوکم پێم بڵێ چی راستەو چی هەڵەیە بەتەواوی هەروەك باوکانی هاوڕێکانم پێیان دەڵێن. هەرزەکار ئەوە دەزانێت کە هێشتا نا مرۆڤەو لە رێگەی دایە بەرەو پێگەیشتن بروات بەڵام هێشتا نەگەیشتۆتە پێگەیشتن. هەرزەکار دەزانێت کە رەفتاری هاوسەنگ رێزی کەسانی دی بۆ دەستەبەردەکات هەروەها حەوانەوەی ویژدانی و باوەربەخۆ بوونیش هەروەها هەرزەکار دەزانێ رووخساری خۆشەویستی ئەمو نێوان باوکی و دایکی لەرێگەی دانانی هەندێك یاساوە دەبێت کە پێویستە هەرزەکارەکە رەوچاویان بکات.

**سەرچاوە:** حديث الى الأمهات

د. سپۆك

## چارەسەری موگناتیسی خەمۆکی کەم دەکاتەوە

لێکۆڵەرەوە ئەمریکیەکان رێگایەکی تازە بۆ چارەسەری خەمۆکی دەرونی دەدۆزنەوە.

ئەم رێگەیە دەکرێت زۆر باشتر بێت لە چارەسەرکردن بەرێگای زەبروو بەرەنگاربونەوە کە ئێستا باوە.

واشنتۆن. ئەو نەخۆشانەی توشی خەمۆکییەکی توند بوون چارەسەرکرد بە رێگای چارەسەری موگناتیسی زۆر زۆر باشترە لە چارەسەرکردن بەرێگای چارەسەری زەبروو بەرەنگار بوونەوە کە لە ئێستادا باوەو دەرئەنجامیکی کاریگەری باشی هەیە بەبێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی لاوەکی هەبێت.

لێکۆڵەرەوەکان دەریان خست چالاك کردنەوەی موگناتیسی یەك لەدوای یەك چەند تەزوییەکی موگناتیسی بەهێز دەدات بەمێشکی نەخۆش بۆ ماوەیەك لەنێوان ١٠-١٥ چرکەدا کەنەخۆش هیچ پێویستیەکی بەبێ هۆش کردن یاخود هێمن کەرەوە نابێت بەپێچەوانەی چارەسەرکردن بە زەبروو بەرەنگار بوونەوە کە دەبێتە هۆی چەند گرژ بونێك، هەروەها نەخۆش توشی نەخۆشی لەبیرچونەوە نابێت وەکو ئەوەی دوای چارەسەرە باوەکە روودەدات.

لێکۆڵەرەوەکان بەراوردیکیان لەزانکۆی ئیلینوی ئەمریکی لەشیکاگۆ کرد لە نێوان چارەسەرکردن بە بەزەبرو بەرەنگاربوونەوە چارەسەری موگناتیسی بۆ (٢٥) نەخۆش کەتوشی خەمۆکییەکی توند هاتبون ئەم نەخۆشانە ١٠-٢٠ دانیشتنی موگناتیسی یان بۆ کرا بەرامبەر ٤-١٢ دانیشتنی چارەسەری، زەبرو و بەرەنگاربوونەوە تێبینی کرا دوای شیکارکردنی هەست و نەست و دوودڵی و کیشەی خەو و هەستکردن بەکەمتەرخەمی و هەندێك شتی دی لەو نیشانانەی لەگەڵ خەمۆکی دا دەردەکەوێت لە هەموو نەخۆشێك دا.

بینرا کە هەردوو کۆمەڵەکە زۆر بە باشی چاك بوونەوە ئەمەش ئەوە دەردەخات کە چارەسەر بە زەبروو بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ چارەسەری موگناتیسی هەمان کاریگەریان هەیە. زاناکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم چارەسەرە تازەیە جێگرەوەیەکی باوەر پێ کراوە بۆ زۆر لەو نەخۆشانەی توشی خەمۆکییەکی توند بوون و سودمەند نەبوون یان توانایان نەبووە بۆ چارەسەری بەرێگای زەبرو بەرەنگاربوونەوە و هەروەها شوێنەواری لاوەکی کەمتری هەیە وەك هەست کردن بە گرژبوونی ماسولکەکانی دەم و چاو لەکاتی چارەسەرکردن یان ژانە سەرێکی کەم لەدوای چارەسەرکردن.

هەتا ئێستا چۆنیەتی کارکردن بەو چارەسەرە تازەیە روون نییە بۆ لێکۆڵەرەوەکان بەڵام باوەر دەکەن کە چالاك کردنی موگناتیسی هاتووچۆی خوێن و چالاکیە کیمیاییەکان لەمێشك دا زیاد دەکات.

**هەناو غالی Internet**

# بەتەمەنترین زیندەوەرەکانی جیهان

لە ئینگلیزییەوە: ئەشنێ جەبار محەمەد
پسپۆڕی ئینگلیزی- زانکۆی سلێمانی

بەردە ماسی کە زیندەوەرێکی ئاویە لە ١٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە توانیوێتی بە شاراوەیی بوونی خۆی بسەلمێنێت زیاتر لە هاوتاکانی خۆی، ئەمەش لە ١,٨٠٠ پێ لەناو درزە بەردەکانی ژێر ئاوی ئۆقیانووسی ئارامدا. ئەو کرمە گەورانەی کە درێژییان ١٠ پێ دەبێت، بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٥٠ ساڵ دەبێت بەزیندوێتی لەناو قوڵاییە تاریکەکانی کەنداوی مەکسیکدا ماونەتەوە.

کیسەڵە ئاویەکان (ڕەقە) بەلایەنی کەمەوە ٧٠ ساڵە لەناو زەوییە تەڕو شێدارەکانی خۆرئاوای ناوەڕاستی ئەمریکادا لە جموجۆڵدان، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك کیسەڵی تایبەتی جۆری گەورە هەیە خۆیان ٣٠٠ ساڵ دەدەن سەرەڕای ڕووبەڕووبوونەوەی باروودۆخە ناهەموارەکان، هەندێك لە درەختە بەرزە سەر سەختەکانی وەکو (سنەوبەر) لە ناوچەکانی کالیفۆڕنیاو چیاکانی دەوری (نیڤادا) بۆ ماوەی زیاتر لە ٥٠٠٠ ساڵە دەژین.

ئەم بوونەوەرە سەرنج ڕاکێشانە چۆن خۆیان سەپاندووە؟ زاناکان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لە کۆشش دان، بەئومێدی ئەوەی زانیاری زیاتریان دەستبکەوێت دەربارەی چۆنیەتی سروشتی یاساکانی بەساڵاچوون (پیربوون)، تا لە ڕێگەیەوە بتوانین ژیانی مرۆڤ درێژتر بکەنەوە.

Calbe. E. Finch توێژەرەوە لە بواری زانستی پیربوون و بەساڵاچوون لە زانکۆی باشوری کالیفۆرنیا دەڵێت، جیهانی سروشتی بەسەدان بابەت لە بواری (بەتەمەن بوون) دا پێشکەش دەکات، یەکێك لە بابەتەکان: دۆزینەوەی ژینگەیەکە کە دوور بێت لە مەترسی گیانەوەرە دڕندەکان. توێژەرەوەکان گیانەوەری بەردەماسی جۆری چاو زەردیان دەستنیشان کردووە کە درێژی دەگاتە ١١٨- تا ١٤٩ ساڵ بەتایبەتی لەناو قووڵایی ئۆقیانووسەکان.

Allen H. Andrews یاریدەدەری توێژەرەوە لە بنکەی زانکۆی کالیفۆرنیا دەڵێت، "ئەم جۆرە ماسییە تەنها لە بەشی قولایی ئۆقیانوسەکەدا بەرگە دەگرێت (دەتوانێت بژی) لەبەرئەوەی زۆربەی گیانەوەرە دڕندەکان لە نزیك ڕووی ئاوەکان جێگیربوون".

زانای ژینگەناسی لە تاقیگەی ژینگەناسی رووباری ساڤانا سەر بە Aiken Justin D. congdon ئەوە روون دەکاتەوە، لە هەندێك جۆری کیسەڵ دەتوانن ماوەیەکی زۆرتر لە ژیاندا بژین لەبەر ئەو بەرگە رەقەی کە هەیانەو دەیانپارێزێت لەوەی کە ببنە خۆراکی گیانەوەرە برسیەکان.

بەهەمان شێوە ئەو سنەوبەرە سەر سەختانەی کە ژمارەی پێوانەییان شکاندووە ژینگەیەکی سەلامەتیان بۆخۆیان هەڵبژاردووە.

ئەم درەختانە لە دەوری ١١,٥٠٠ پێ لە سەرو ئاستی رووی دەریاوە بڵاوبوونەتەوە کە باڵایان زۆر بەرزە ئەمەش دەیانپارێزێت لەوەی کە ببنە خۆراکی چەندەها مێروو. بۆ نمونە: درەختێکی سنەوبەر لە نشێوەکانی ناوچەی (نیڤادا)دا واخەملێنرابوو کە تەمەنی ٤٩٠٠ساڵ بووبێت بەپێی بنەمای گەشەی ساڵانەی بازنەیی قەدەکەی بەرلەوەی ببڕێتەوە لە ساڵی ١٩٦٤.

Finch بەسەر سوڕمانەوە دەڵێت: "ئەم درەختانە هەرچەند تەمەنیان بگاتە ٤٠٠٠ ساڵیش بەلام وادەردەکەون کە لە یەکەم ڕۆژی تەمەنیاندا بن.

بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ زاناکان خۆیان بە لێکۆڵینەوە دەربارەی (بەتەمەن بوون) لەناو گیانەوەران و رووەکەکاندا سەرقاڵ نەدەکرد، بەبڕوای ئەوان زۆری ڕێژەی مردنی پێشوەختی بوونەوەران لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەکانی

وەکو : بوونی ئاژەڵە درندەکان و ململانێی نێوانیان لەپێناو مانەوەدا، کارەساتە سروشتی‌یەکان، مێرووەکان، یاخود بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، بەڵام ئێستا ئەم بۆچوونانە لە گۆڕاندان.لەسەر دەستی زانای بایۆلۆژی steven.

N.Austad لە زانکۆی Idaho پێوەرەکە گۆڕا بۆ لێکۆڵینەوەی کاریگەری ژینگە لەسەر بەساڵاچوون و بەتەمەن بوون، بۆ ئەم مەبەستەش لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا لەسەر ئاژەڵی Opassum کە مشکێکی بچوکە لە ناو دارستانەکانی ئەمریکادا دەژی ئەم جۆرە مشکە بە خێرایی دەژی و بەخێرایی دەمرێت واتە (تەمەنی کورتە).

Austad گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە (opossum)ەکان دەتوانن ماوەیەکی زۆرتر لەژیاندا بمێننەوە و گەشە بکەن بەمەرجێك دووربن لەو کاریگەریە بەردەوامەی کە لەلایەن ئاژەڵە درندەکانی وەکو کوندەپەپوو گورگ لەسەریانە.

لە ماوەی ١٠ ساڵی ڕابردوودا بەپێی ئەو پێوانە کردنانەی کە Austad ئەنجامی داوە لەسەر شانەی (opossum) ەکان لە دورگەی (Sopelo) نزیك بەرزاییەکانی کەناری ویلایەتی جۆرجیا، لەم ناوچەیەدا تەمەنی (opossum)ەکان بەڕێژەی ٥٠٪ درێژترە گەر بێتوو بەراوردبکرێن بەناوچە سەرەکیەکانیان، بەڵام ئێستا Austad سەرقاڵی گەڕانە بەدوای (تەمەن درێژی)یەکی لەو شێوەیەدا لەناو دوورگەی مشکەکاندا، بەرەچاوکردنی ئەوەی ئەمانە ئاژەڵێکن کە دەتوانرێت بە ئاسانی لێکۆڵینەوەیان لەناو تاقیگەدا لە سەر بکرێت.

لێکۆڵینەوەکەی Austadتیشك دەخاتە سەر بەردەوامی لە بەساڵاچوون دا، کە ژینگەیەکی تەواو دەتوانێت ژیان بۆماوەیەکی زۆرتر بهێڵێتەوە. ئێستا ئەم پرسیارە لە ئارادایە: لە کاتێکدا گەر گیانەوەرە درندەکان و ناکۆکیەکانیان دوور بخرێتەوە، ئایا پرۆسەی بایۆلۆژی کاردەکاتە سەر بەساڵاچوون لەناو ئاژەڵەکاندا، بەو ئاژەڵانەشەوە کە ژیانیان دوور لە مەترسیە؟ بۆ ئەم مەبەستەش Austad لەگەڵ Donna J. Holmes توێژەرەوە لە بواری ژینگەزانی سەر بەزانکۆی Idaho ڕووی لێکۆڵینەوەکانیان کردە ئاسمان.

پێنج ساڵ لەمەوپێش پێشنیازی باڵندەکانیان کرد بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەسەربکەن وەکو ئاژەڵێکی نمونەیی بەکار بهێنرێن لە لێکۆڵینەوەی پیربووندا.

پێکهاتەی بایۆلۆژی باڵندە نزیکە لە پێکهاتەی بایۆلۆژی مرۆڤەوە لە چاو کرمەکان و مێشی میوەهات دا، ئەمەش باشترین بابەتە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر بەساڵاچوون لە تاقیگەکاندا. ئەم زیندەوەرانە وەکو ئێمە خوێنیان گەرمە،

هـەندیك بـەری دی بـەکاردەهینریت و هـەندیك جـاریش ئـەم کرداره بۆ پوختەکردنی عەتر بەشیوەی راستەوخۆ پیویستە.

**پوختەکردنی رۆنە عەترییەکان لە دەردراوی گیانەوەرەوە:**

دەشیت هەندیك دەردراوی گیانەوەر رۆنی سەرەکیان تیدا بیت، کە مادەی عـەتری بۆن خۆشن، و لیرەدا بە پیویسـتی دەزانین ئاماژە بۆ هەندیك لەو رۆنانە بکەین.

١-کاستور: ئەمە مادەیەکی رۆنیە، جۆریك لـە سمۆرە کە بەسەگی ئاوی ناو دەبریت، دەری دەدات، ئەم مادەیـە رەنگی پرتـەقالی مەیلـەو بـۆرە رژینیکـی تایبـەتی دەری دەدات، کـە مادەی کیمیایی وەك ئەلکهول و بەنزیك و ئەسیتون و هـی دی تیادایە.

٢-کەرە-مادەیـەکی رۆنیـە کـە لـە رژینـی ژیژکە پشیلە کە ئەمیش گیانەوەریکە لەپشیلە دەچیت و خـاوی کـەرە بۆنـی ناخۆشـی هەیـە بـەکرداری مانـەوەو. روون کردنـەوە دەروات و لـەدوایدا بۆنیکـی خـۆش کـە لــە بۆنــی گــوڵ دەچیت پەیدا دەبیت. رۆنەکە لە پیکهاتنی دا مــادەی کیمیــایی ناســراو بــە ســیتوفیتۆنی تیدایە کـە ئـەمیش کیتۆنیکـی ئەلقەیـە بۆنـی خۆشیتی تیدایە.

٣-مسك-مادەیەکی بۆن خۆشە لـە حـەراب کـە دەکەویتـە ژیـر پیسـتی نـاوەوەی نـیرەی (ئاسکی مسك) دیت، ئەم بۆنە بەهۆی کیتۆنی ئەلقە لە رۆنەکەدا کە بەمسکۆن ناو دەبریت، دەردەچیـت کـە ئـەمیش گرانـترین و کۆنـترین عەترە.

٤-عەنبـەر- مادەیـەکی مۆمیـە بەسـەر هـەندیك کـەنارە ئیستوایەکانەوە دەنیشیت و سەرچاوەکەی نەهەنگی عەنبـەرە کە لە ریخۆلەی ئەم نەهەنگەدا هەیە.

**ئەو مادە کیمیاییانەی لە رۆنی عەتردا هەن:**

رۆنـە سـەرەکیە (عەتریـەکان) چـەندەها مـادەی کیمیـایی جیاوازیان تیدایـە هـەر یەکـەیان بەهۆی ئـەو سەرچاوە رۆنـە سەرەکی و پلەی خاوینی مادە کیمیایەکان لە رۆنە عەتریەکان دا هەیە، وەك :

١-ئەسـتـەرەکان-ئەمانــە زۆربــەی وەرگـیراوی ترشــی بـەنزویك و سـرکیك و سالسیلیك و سـیامیکنن، ئەسـتـەرەکان بەگشتی بۆن و بەرامەیان خۆشە.

لـە پیکهاتنـە گرنگـەکانی میوەو گولـە عەتریـەکانن. بۆنـی بەهەوادا چووی مۆز بۆنی ئەستەرەکانە کە لە نیوان سرکاتی ئەسیل تـا هیکسـاناتی هیکسـیل دریـژ دەبیتـەوە. ئـەم بۆنـە بـەپیی گەیشتنی میوەکە زیـاد دەبیـت. و فۆرمـاتی ئەسـیل مادەیـەکی بۆن دارە لـە خواردنـەوە ئەلکهولیـەکان و شـیرینی و سرکاتی ئایزوپینتیل بەکاردەهینریت، مادەکـە بـۆن و تـامی مۆزی لی دیت. سرکاتی ئۆکتیك ئاسایی بون و تامی پرتەقالی لی دیت و مەسیل بیوسیرات ئاسای بۆنی سیوی هەیە.

٢-ئەلکهولـەکان- وەك لینـالۆل و جیراسیۆل و تـیرونیلۆل و تربینیول و منسۆل. لینالۆل رۆنی لاوەندە، سترال رۆنـی لیمۆ و جیراسیۆل عـەتری جنیدیـەو سـتیرونیلول لـە میتـابولیزمی ئەسیتات پیك دیت.

٣-ئەلدیــهایدەکان: وەك بــەنز ئەلدیــهاید و سینام ئەلدیهاید و فانیلین.

٤-ترشــەکان:وەك بــەنزویك و ســـیناميك و مایریستك.

٥-فینۆلــەکان: وەك یوجینــۆل و ســـایۆل و کارفکرۆل.

٦-کیتۆنــەکان: وەك کـــافرۆن و مینســـۆن و ئارۆل و کافور.

٧-لاکتۆنەکان: وەك کیۆمرین.

٨-تربینا: وەك ئەلبینین و لیمۆنین.

٩-هایدرۆکاربۆنەکانی وەك ستایرین و سیفین.

**پیشەسازی نوێی عەتر**

تویژینـەوە کیمیاییـەکان لـە سـەدەکانی دوایـدا کــە لەســەر رۆنــە ســەرەکییەکان کــران گــەلیك لــەو ئاویتــە کیمیاییانەیان دەستنیشانکرد کە عەتریان تیدایە و ئەوانـەی بۆن و بەرامەیان خۆشە جیایانکردنەوەو خرانە ژیر خویندن و لی کۆلینــەوەوە. تۆژەرەوەکـــان توانیـــان ئۆکســـیدی گـــوڵ (ئەویش ئیسەری تربینویدییە لەرۆنی گولی بلکاری لە سالی ١٩٥٩ جیابکەنەوە) ئەم مادەیە رەنگی سەوزی گیاییە بۆنیکی خۆشی هەیە، لە پیشەسازی عەتردا دەکریتە سابوونەوەو بە کـاردەهینریت. توانیـان زنجیریك لـە لی وەرگـیراوی ئاویتـەی ئەلکیل ئەلۆکسیدی پایردین لە رۆنی ئەلگیانیوم وەربگرن ئەم مادەیە بۆتە مادەیـەکی گرنگ لـە پیشەسازی عـەتری نوێدا. ژمارەیـەکی بـەربوومی سروشـتی کـە لـە مـادەی گیانـەوەری پوختە دەکریت لە پیشەسازی عـەتردا بەکار دەهینریت وەك مسك و عەنبەر.

لەم دواییەدا کیمیاییەکان توانیان ئاویتەی بریکاری عەتر دروست بکەن. بەمەش دەست هاتی زۆر باش بۆ زانا رۆزیکا بەدەست هـات کـەتوانی دەسـت نیشـانی پیکهاتنی ئەلقـەی ئاویتەی سیفیتۆن‌و مسکۆن بکات کە ئەمانەش ئەو ئاویتانەن کە لە مسك‌و کەرەدا هەن.

زۆر مـادەی کیمیـایی لـە رووەکـدا هـەن، کیمیاوییـەکان لەسـەدەکانی دوایـدا گرنگیـان داوە بـە جیاکردنـەوەی ئـەم مادانـەو لـە پیکهاتنـە کیمیاییـەکانیان کۆلیونەتـەوە لـەرۆنی لیمۆدا توانیان ئاویتەی کیمیایی تربین ئەلدیهاید مسترالیان دەست بکەویت، ئەم مادەیە بۆنـی لیمـۆی تـازی لی دیت، و هـەروەها مادەی یوجینۆل لە رۆنی میخەك دەربـهینن، جگـە لەوە تۆژەرەوەکان توانیـان مەسیل یوجینول ولی وەرگـیراوی ئـازویوجینول ئامـادە بکـەن، ئـەم مادانـە تـا ئیسـتا لـە پیشەسازی عەرتی نوێدا بەکاردەهینرین‌و گرنگن.

**بەکورتی:**

مادە کیمیاییەکان کە لـەم رۆژەدا بـەکاردەهینرین لەسـەر بناغـەی بـرو جـۆر دەپۆلیـنرین، رۆنـی سـەرەکی بەرهـەمی رووەکە، کە هەمیشە لە رووەك وەردەگیریت‌و بری لەسەر باری وەرز و کەش دەوەسـتیت، و لـە پیشەسـازی عـەتردا دەبیتـە هۆی بەرز و نزمی لە نرخی عەترەکەدا بە پیچەوانەی مـادە دەسـتکردەکان، کـە دەتوانریـت بـرو نرخیـان لـە بـازاردا رابگـیریت، و بـری پیویسـت بـە بـازار بدریـت. سـەبارەت بـە جـۆری رۆنـی سـەرەکی لـە وەرزیکـەوە بـۆ وەرزیکـی دی دەگۆریت، بەپیچەوانەی مادە کیمیاییە دروست کراوەکانـەوە کە دەتوانریـت رەوشـت‌و جـۆری تایبـەتی بـەپیٚ‌ی داواکـردن پییان بدریت مادە کیمیاییە دروست کراوەکان کە ئاماژەیـان بە هەندیکیان دا لەم چارەکە سەدەی دوایدا بریکی زۆریان لە بازاری جیهانی عەتردا بەکارهینران، بەڵام بـە هیـچ جۆریـك ناتوانن جیگای رۆنـی سـەرەکی لە پیشەسازیدا بگرن، بۆن‌و بەرامەی مادە دەست کردەکان بە ناتـەواوی دادەنریت ئەگـەر بە رۆنی سەرەکی سروشتی گیانەوەری بەراوورد بکرین، رۆنە سـەرەکییەکان تیکـەلیکی ئـالۆزی مـادەی عـەترین بـۆن‌و بەرامـەی خـۆش و کاریگـەریان هەیـە، لەگـەڵ مـادە عەتریـە دەست کردەکان بەراورد ناکریت، بۆیە عەتری رۆنە سەرەکی سروشتی‌یەکان نرخیـان گـران بەهایـە، بـە بـەراورد کردنیـان لەگەڵ نرخـی عـەتری مـادە دەسـت کردەکـان. لەبەرئـەوە بـۆ ئەوانـەی لەپیشەسـازی عـەتردا کاردەکـەن وا چاکـترە هاوسـەنگی گونجـاو بدۆزنـەوە، تـا بـۆ ئـەم دوو سـەرچاوەیە پشتی پیٚ ببەستن.

## زاناکان هۆرمۆنیکیان دۆزیەوە ئارەزوی خواردن کەم دەکاتەوە

هۆرمۆن لەناو کۆئەندامی هەرسدا دوای خۆراك خواردن دەرژیت، و بەدەست کەوتنی بریکی زیاتر لـەو هۆرمۆنانـە مژینـی گـەرمی خـۆراك کـەم دەبیتەوە.

ئۆتاوا– کەنەدا: زاناکان لە راپۆرتیکی‌زانستی کەنـەدیدا ئاشـکرایان کـرد کـە هۆرمۆنیـك هەیـە ئارەزوی خۆراك کەم دەکاتەوە ئەوەش یارمەتیمان دەدات کە نەهیلیت قەلەوی بەشیوەیەکی تایبەتی بلاوبیتەوە.

لـە راپۆرتیکـدا کـە لـە گۆڤـاری (Nature) دا بلاوبـوەوە ئـەو هۆرمۆنـەی کـە ئاشـکرا کـراوە سیٚ‌یەکی ئارەزووی خۆراك کەم دەکاتـەوە، جگـە لەوەش ئیستا وای دادەنیت کە بەشیوەی دەرزی لـەدەماریکی تایبـەت بـەو هۆرمۆنـە لەکەسـەکە دەدریت بۆ ماوەی ٩٠ خولـەك هـەتا کـاری خـۆی دەکات. زاناکان دانیان بەوەدا نا کە ماوەیەك تیپەر دەبیت بەرلەوەی بگەنە حەپ یان دەرزی هۆرمۆنە خیراکە کە ناسراوە بە (BYY) کە هـەمان ئەنجامی دەبیـت، و ئـەو هۆرمۆنـەی بەشـیوەی سروشـتی دەردەچیت تارادەیەکی زۆر ئارەزووی خواردن بۆ ماوەیەکی کەم کەمدەکاتەوە.

پرۆفیسۆر ستیڤن بلوم لـەکۆلیژی مەلـەکی لـە لەندەن وتی دەتوانین شوینەواری هۆرمۆنی (BYY) لـە کـەم کردنـەوەی ئـارەزوی خـواردن دا ئاشـکرا بکـەین بەشـیوەیەکی زۆر بـۆ ئەوانـەی کـە توشـی کیشـەی قەلـەوی بـوون، هـەروەها وتـی هۆرمۆنـی ئاشـکراکراو دەبیتـە هـۆی ریگرتـن لـە ئـارەزووی خـــواردن بەمـــەش بـــری خۆراکـــی وەرگـــیراو بەشیوەیەکی زۆر کەم دەبیتەوە.

زاناکـان لـە رۆژنامـەی (جلـوب ئـاندمیل) لـە وتەیـەکیاندا دەلیـن ئـەو هۆرمۆنـە لـە کۆئـەندامی هەرسەوە دەردەچیت دوای خۆراك خواردن، و بری ئەو هۆرمۆنەی دەردەچیت بەگویرەی ژمارەی ئەو کالۆریانـەی کـە لـە خۆراکـە وەرگیراوەکـەدان لـە ژەمیکدا.

زاناکـان لـە ئوسـترالیاو کەنـەداو ئەمـەریکا دۆزیویانەتـەوە کـە ئـەو نەخۆشـەی ئـەو بـرە هۆرمۆنەی دەدریتیٚ یەکسانە بەو برە هۆرمۆنـەی کە لەش دەری دەکات، لە دوای دانی هۆرمۆنەکە لـەماوەی ٢٤ کـاتژمیردا لەشـی نەخۆشـەکە سیٚ‌یەکی گەرمی سروشتی ئەو خۆراکەی مژیووە و هـەروەها هەسـتیان بـەوەکردووە کـە هەسـتیان بەبرسـیتی لـەماوەی ١٢ کـاتژمیری یەکـەمدا کەمتربووە.

لەلیکۆلینەوەیەکدا هاتووە کە تاقیکردنەوەکان کاریگـەرە لاوەکییـەکانی هیـچ دەرنەخسـتووە بـە پیچەوانـەوە نەخۆشـەکان کـەمتر هەسـتیان بـە برسیتی کردووە.

هـەروەها زاناکان لە کەنەدا دەلین کـە ٤٨٪ی ئەو کەسانەی کە کیشیان زیادی کردووە لەکیشی سروشتی خۆیان نزیکەی ١٥٪ یان قەلەوی بوون بەهۆی کەمی ئەم هۆرمۆنە لە لەشیاندا.

# لەیزەر..
# چارەسەری سیحراوی..

هانا جەمال

پیتـەکانی ووشـەی لـەیزەر (LASER) کورتکراوەی دەستەواژەی ئینگلیزی (بەتین کردنـی رووناکی بـەریگای تیشـکدان بـەبزواندن)ە، لـەیزەر تیشـکیکی بـەهیزی رووناکیـە کـە شـەپۆلەکانی هاوبـارن و، مـەودای دریـژی شـەپۆلەکانیان لـە نیـوان (١٩٣-٤٠٠٠)نانۆ مەتر دەبیت (١ نانۆ مەتر دەکاتە یەك بـەش لـە هـەزار ملیـۆن بەشی مـەتریك). واتـە مـەودای تیشـکی لـەیزەر دەکەویتە ناوچـەی تیشکی بنەوشـەیی و تیشـکی خـوار سـورەوە لـە شـەبەنگی کارۆموگناتیسیدا (ئیستا لەیزەری دیکـەش بەرهەم هینراون)

هەر لە سالی (١٩٦٣)ەوە تیشکی لەیزەر وەك چارەسـەر بەکارهینراو خۆش لەوەدایە چاو کـە یەکـەم ئەندامی لەشی مرۆڤە بەوتیشکە چارەسەرکرابیت، لـەیزەری یاقوتی بۆ مـەیاندنی خوینبـەربوونی موولوولە خوینیـەکان و

ساریژکردنی برین و کونەکانی تۆرەی چاو بەکارهینرا، چونکە چاو ناوەندیکی روونەو روونـاکی تیـایدا دەشـکیتەوەو توانـای کۆکردنـەوەی تیشـکەکەی هەیـە لـە تیشکۆیەکدا کە توانستی سووتاندن بدات بەتیشـکەکە، ئیـتر ئـەو چارەسـەرکردنە سـەرەتاییانە دەروازەیـان کـردەوە لەبـەردەم بوارەکـانی دیکـەی چارەسـەرکردنی نەخۆشیەکانی چاوبەگشتی.

نەشتەرگەری چاو لە ریگـای بـەکارهینانی لـەیزەرەوە زۆر ووردو سـەلامەت و دەسـت بەسەردا گرتوو دەبیت، لەگـەڵ ئەوانەشدا نەشـتەرگەریەکە زۆر سـەرکەوتوو بـەکاردەبیت، دەتوانریـت چارەسـەری هـەندیك لـە نەخۆشـی و گرفتـەکانی چاوبکریت بـەهۆی تیشکی لـەیزەرەوە بەشـیوەیەکی باسـترو خیراترو ئابووری تر لـە هـەردوو رووی مـادی و کاتـەوە، لـە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیە کە ئەو جۆرە نەشتەرگەرییانە زۆر سەلامەتن. تیشکی لەیزەر دەتوانیت بگاتە ئەو ناوچانەی ناو

چاو کە هیچ هۆکارێکی نەشتەرگەری پێی ناگات، هەروەها لەیزەر دەتوانێت بینایی بگێڕێتەوە بۆ هەندێك لەوانەی ئەو نیعمەتەیان لە دەستداوە، و ڕێگری لەدابەزینی ئاستی بینین دەکاتو ، لە ڕێگای سەردانی بەردەوام بۆ پسپۆڕی چاو و بەکارهێنانی چارەسەرەوە دەتوانرێت کە ئاستی بینیەکە بەجێگیریو ساغی بهێڵێتەوە، بێ گومان چارەسەرکردن بەتیشکی لەیزەر زیاتر کاریگەرو سەرکەوتوودەبێت ئەگەر زوو نەخۆشیەکە دیاریکراو چارەسەری بۆ کرا.

لەو هۆکارو چاکیانەی کە وایان لە تیشکی لەیزەر کردووە وەك چارەسەرێك بەکار بهێنرێت، لەیزەر سەرکەوتوانە لەوبارودۆخانەدا کاری خۆی دەکات کە بەڕێگای چارەسەری ئاسایی ئەنجام نادرێت، هەروەها لەکاتی نەشتەرگەریدا خوێنبەربوون ڕوونادات کە ڕێگری لە نەشەتەرگەریەکە دەکاتو برینەکان زوو ساریژ دەبن، ئەگەر برین هەبێت، لەکاتێکدا ئەوبرینانە لەڕێگای ئاسایی نەشتەرگەریەوە درەنگ ساریژ دەبن، هەروەها لە ڕێگای لەیزەرەوە نەشتەرگار دەگاتە هەموو شانە نەخۆشەکانو کردارەکە بێ ئازارەو پێویستی بە بەنج کردنی گشتی نابێتو، هەروەها پێویست بەکاتی مانەوە لە نەخۆشخانە ناکات بۆ چاکبونەوە، چونکە نەخۆش هەر لەپاش ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکە دەتوانێت نەخۆشخانە بەجێبهێڵێت، جگە لەوانەش کاتی چارەسەرکردنەکە بە لەیزەر زۆرکەمەو تێچوویشی هەر زۆرکەم دەبێت. چەند جۆرێك لەیزەر هەیە کەلە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی چاودا بەکاردێت، لەوانە: لەیزەری لە حیمەکار، لەیزەری خوێن مەیەنەری موولەکانی تۆڕەی چاو، لەیزەری ساریژکاری کونو برینەکان، لەیزەری بڕەڕی پەردەو ناوچە تۆپەڵ بوو کەڵەکەبوەکان لەشانەکاندا و لەیزەری بەهەڵمەکاری سوتێنەر. دەبێت ئەوەش بزانین کە هەر جۆرێکی تیشکی لەیزەر تایبەتە بە جۆرە شانەیەکی چاو کە بەو جۆرە لەیزەرە کاریگەرە، واتە درێژی شەپۆلی تیشکە لەیزەرە بەکارهاتووەکە بەڕیاردەدات کە بۆ چ جۆرە شانەیەك بەکار بهێنرێت، بەو جۆرەش شوێنکاری تیشکە لەیزەرەکە لە ناوچاودا دیاریکراو دەبێت.

نەخۆشیەکانی چاو: لەو نەخۆشیانەی چاو کە بەهۆی تیشکی لەیزەرەوە چارەسەر دەکرێن: خراپ بوونی تۆڕەی چاو بە هۆی نەخۆشی شەکرەوە، چارەسەریەلەیزەریەکان لەکاتی گونجاوی خۆیدا سەلماندویانە کەچاو پارێزراو دەبێت لە خوێنبەربوونی دووبارە بوەوەو بەردەوام و تیشکی لەیزەرەکە ڕێگری دەکات لە تۆپەڵ بوونی خوێنە بەربووەکەو، پارێزی دەکات لە ئاستی بینینو چاو دەپارێزێت لە کوێربوون. نەخۆشیەکی دیکەی چاو، داخستنی خوێنبەری ناوەندی تۆڕەی چاوە بەشێوەی تەواو یان بەشی، ئەوەش لە ئەنجامی پەیدابوونی موولوولە لە خوێنی لاوەکیەوە، کە تیشکی لەیزەرەکە ئەو موولوولە مشە خۆرانە لەناو دەباتو، ساڕێژی کونو برینو دڕاویەکانی تۆڕە دەکاتو بەوەش تۆڕە دەپارێزێت لە جیابوونەوەو کوێر بوون، نەخۆشیەکی دیکەی چاو پەیدابوونی موولولەی خوێنی لاوەکی لە چینی ناوەڕاستی چاودا کە دەناسرێت (المشیمیة)، لە ئەنجامی ئەوەشدا ناوچەی پەڵەی زەرد لەسەر تۆڕە لاواز دەبێتو نامێنێت، بۆچارەسەری ئەو نەخۆشیەش لەیزەرێکی تایبەتی بەکاردەهێنرێت کە بە لەیزەری سارد دەناسرێتو ئەو موولوولە زیادە پەیدابوانە لەناو دەبات بەبێ ئەوەی زیان بدات لە شانە ساغەکانی تۆڕە. هەمان شێواز بەکاردەهێنرێت بۆ لەناوبردنی وەرەمی لوولە خوێنییەکان بەبێ ئەوەی پێویست بکات نەشتەرگەریو بەنج کردنی گشتیو مانەوە لە نەخۆشخانە بۆ ماوەی زۆر نەخۆشەکە هەراسان بکات.

نەخۆشی ئاوی ڕەشیش یەکێکی دیکەیە کە تووشی چاو دەبێت، بەهۆی تیشکی لەیزەرەوە کونێکی بچووك دەکرێتە ڕەنگێنەی چاوەوە کە ئاوی چاوەکەی لێوە دەگوێزرێتەوە بۆ بەشی پێشەوەی چاوو لەوێشەوە دەردەهێنرێتە دەرەوە، و دەشتوانرێت هەربەهۆی لەیزەرەوە چارەسەری نەخۆشی ئاوی ڕەش بکرێت لە جۆری زۆر تیژو پێشکەوتوی.

هەروەها دەتوانرێت بەهۆی تیشکی لەیزەرەوە چارەسەری ئەو ئاوەی ناوچاو بکرێتو ئاوەکە لە قنچێکی چاوەکەوە بکرێتە دەرەوەو پێویست بە نەشتەرگەری دەکات. هەروەها بۆ لابردنی ئاوی سپی ناوچاو تیشکی لەیزەر بەکار دەهێنرێتو ئاوەکە دەمژرێتو نامێنێت بەبێ ئەوەی پێویست بکات بە بەکارهێنانی ئامێرەکانی شەپۆلەکانی سەرو دەنگ کە تائێستاش ئەو شێوازەی نەشتەرگەریە لەژێر توێژینەوەو پەرەپێداندایە.

جگە لەوانەی پێشو تیشکی لەیزەر لە نەشتەرگەری جوانکاریشدا بەکار دەهێنرێتو، تورەکەو وەرەمە بچووکە

مەمیلەییەکان و نیشانە ڕەنگدارەکان و زیادە گۆشتەکان و لۆچییەکانی دەوری چاو هەموویان بەهۆی تیشکی لەیزەرەوە لادەبرێن بەبێ ئەوەی هیچ پەڵە یان ئاسەوارێك بەجێ بهێڵێت. هەروەها بەهۆی تیشکی لەیزەرەوە چرچ و لۆچی و ووشکی و کشانی پێستی پێڵوی چاوەکان و گۆشتی زیادەو فووتێکرانی دەوری چاوەکان هەموویان لادەبرێن و سیماو ڕووکاری پیری لەسەر دەموچاو هەڵدەگیرێت و ڕەونەق و جوانی و لاوێتی دەگەڕێتەوە بۆ دەمو چاوەکان.

لەو عەیبە بیناییانەی کە زۆر بڵاون و تیشکی لەیزەر دەتوانێت ڕاستیان بکاتەوە هەرچەندە تەمەنی ئەو تیشکە ئەوەندە زۆرنیە، چارەسەرکردنی عەیبەکانی شکانەوەی بیناییە لەنێو چاودا ئیتر لە هەر جۆرێکی وەك دووربینی، نزیك بینی یان لاربینی بێت.

ئەو لەیزەرەی بۆ ئەو مەبەستانە بەکاردێت بەناوی لەیزەری (ئەکزایمەر)ەوە دەناسرێت، کەپێك دێت لە تێکەڵێکی هەردووگازی فلۆروئارگۆن و درێژی شەپۆلەکەی (١٩٣) نانۆمەتر. بنچینەی لەناوبردنی سەر توێژاڵەکانی سەر کۆرنیەی چاو بەهۆی لەیزەرەکەوە بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەستی نێوان گەردیلەکانی کاربۆن و بوون بە هەڵمیان و دەرچوونیان بە شێوەی گاز. ئەوەی سەیرە لەو کردارەدا ئەو وردی و دیقەت و ڕێکسازیە کە لەلابردنی توێژاڵەکەدا بەدی دێت و هەموو کردارەکانیش لەژێر کۆنترۆڵ و پێوانە کردندا دەبن، پرتەیەکی کورت کە لە (٥٠ نانۆ/چرکە) تێپەڕناکات و بەقوڵایی تەنها (٣ مایکرۆندا) دەڕوات، بۆیە ئەوگەرمیەی دروستی دەکات هیچ مەترسی نابێت بەهۆی لەناوبردنی شانەکان و یان ئازاردانیان و، هیچ مەترسی لە سەرکۆرنیەی چاو نابێت و ناهەوسەنگیش لەکرداری بینین دا ڕوونادات پاش ڕاستکردنەوەی بینینەکان. لەکاتی تووش بوون بە نزیك بینی پێویستە سەر ڕووی کۆرنیە تا ڕادەیەکی کەم تەخت بکرێت، بۆ ئەمەش بەهۆی لەیزەرەکەوە توێژالیکی تەنك بەشێوەی پەپکەیەك لەسەر ڕووی کۆرنیە لادەبرێت، لابردنەکەش لەسەر بنچینەی پلەی نزیك بینی کەسی تووشبووە. بەڵام بۆ چارەسەری دووربینی واپێویست دەکات کە کووریتی کۆرنیە زیاد بکرێت ئەوەش بەچالکردنیکی ئەلقەیی بەدەوری کۆرنیەدا، بۆ ئەو مەبەستەش کلاوەیەکی پەپکەیی لە کۆرینەوە وەردەگرن و چاکسازی تیادا دەکەن بەهۆی تیشکی لەیزەرەوەو ئینجا پارچەکە دەگیرنەوە بۆ ناوچاو و نەخۆش لە ماوەی (٢٤) کاتژمێردا هیزی بینینی ئاسایی خۆی بۆ دەگیردرێتەوە.

لەیزەر چارەسەری سیحراوییەو کیش دەزانیت کە لەم سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمەوە بەدواوە چی دیکەی لە ئامێز گرتووە لە بواری چارەسەرکردندا و لە هەموو بوارەکانی نەخۆشیدا.

**العربي: عصا سحرية تدخل العين**

**د. سرى سبع العيش**

## سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەکانی حەبی ئینسولین دا

**سان فرانسیسکۆ/**

تۆژەرەوەکان ئاماژەیان بەوەدا کە ئەو ڕۆژە دیت کە دەرزی ئینسولین دەبیتە بەرهەمە کۆنەکانی بواری زانست و پزیشکی نزیکە لەوەی کە بتوانیت چەند هۆکاریك دابهینیت کە پالپشتی نەخۆشی شەکرە بیت بەریگای قوتدان و هەلمژینی پرۆتینیکی زیندەیی.

هەندیك لە نەخۆشانی شەکرە پەنا دەبەنە بەر بەکارهینانی ترومپایەك بۆ دەستکەوتنی ئاستیکی ریکخراو لە ئینسولین لەژیر پیستدا. بەلام زاناکان سالانیکە کاردەکەن بۆ دۆزینەوەیەك لە جیاتی بەکارهینانی دەرزی ئازاردەر کە ئاسان نیە بۆ دەست کەوتنی دۆزیکی کورت خایەن کە نەخۆش پیویستی پییەتی لەکاتی خواردنی خواردەمەنیدا بۆ گۆرینی نیشاستەو شەکر جگە لەوانەش گۆرینی توخمە خۆراکییەکانی دی بۆ ووزە.

لیکۆلینەوەکان روونیان کردەوە کە کۆمەلەی شەکرەی ئەمریکی سان فرانسیسکۆ بۆ دەست کەوتنی ئینسولین کە سەرکەوتنیکی خیرای بەدەست هیناوە کە دەگەریتەوە بۆ بەکارهینانی حەپ و پرژینەر بۆ ناو دەمو جۆری جیاواز لە ئینسولین وەردەگیریت بەهەلمژین بەلام هەموو ئەم دەرمانانە هیشتا زۆریان لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی پاش چەند سالیکی دی بخرینە بازارەوە.

کۆمەلەکە دەیخەملینیت کە زیاتر لە (١٧) ملیۆن ئەمریکی دەنالینن بەدەست شەکرەوە، ووتیان ٣,٧ ملیۆنیان پیویستی بە (١ تا ٥) دەرزی لە رۆژیکدا هەیە بەکاری بهینن بۆ دەست بەسەراگرتنی نەخۆشییەکە.

ئەم نەخۆشییە ریگرە لە بەکارهینانیکی دروست لە ووزەی بەرهەم هاتوو لە خواردەمەنییەوە بۆیە پیویستی بەئینسولین زیاتر هەیە بۆ دەست بەسەراگرتنی ئاستی شەکر لەخوین دا چونکە گەر چارەنەکرا ئەوا دەبیتە هۆی توش بوون بەنەخۆشی دڵ و کویری و برینەوەی ئەندامەکانی و گەلیك دەردی دی.

شەکرە یەکیکە لەو پینج نەخۆشییە گەورەییەی هۆکاری مردن لە ولاتە یەکگرتووەکاندا دادەنریت، کۆمپانیای نوبیکس بەهاوکاری لەگەل کۆمپانیای گلاکسو سمیس دا گەشەی بەحەبیك داوە کە دەتوانریت لەبری دەرزی ئینسولین بەکاربهینریت پیش نان خواردن بۆ دەست بەسەراگرتنی ئاستی گلوکۆز کە لەش لەریگای خواردنەوە دەستی دەکەویت، بەریوەبەری جیبەجێ کردنی نیوجیکس دەریخست تاقی کردنەوەکانی ناوەند لەسەر حەبەکە بەردەوام بوو بۆ سێ رۆژ بۆ ٣١ نەخۆشی لە جۆری یەکەمی نەخۆشی شەکرە کە توشی کەم تەمەنەکان دەبیت، و دەریشیخست کە هاوشیوەی ئینسولین دەرزییەکە بۆ دەست بەسەراگرتنی گلوکۆز بەکاردیت، هەروەها بۆ هەمە جۆری وەلام دانەوەی حەبەکە، هەموویان بوونە هۆی دابەزاندنی ئاستی شەکر لە خویندا.

کومپانیاکە ئەو حەبەی بەهۆی زیادکردنی گەردیکی بچوکی ئینسولینەوە داهینا تا بەرگەی هەرس بگریت و لە هەمان کاتدا توانای مژینی جگەر بۆی زۆر بیت.

ژیان ئەسعەد **Internet**

# نەخۆشی تۆکسۆپلازما

## بڵاوبوونەوەو چارەسەر

هەڤپەیڤین: **دکتۆر جەمال سالح**
پسپۆری نەخوشیەکانی هەناو
ئامادەکردن: **کانی عبدالله**

یەکیك لەو مشەخۆرانەی لە لەشی شیردەرەکاندا دەژی و لە ناویشیاندا مرۆڤ. مشەخۆری تۆکسۆپلازمایە، بۆ دەستنیشانکردن و زانینی هۆکارو بڵاوبونەوەو خۆ پاراستن و چارەسەری بە باشمان زانی هەڤپەیڤینی دکتۆر جەمال سالح، پسپۆری نەخۆشیەکانی هەناو بکەین. و ئەم پرسیارانەمان لێ کرد، و بەریزیشی بەم شیوەیە وەڵامی داینەوە:

**پ١/نەخۆشی Toxoplasmia توشی کێ دەبیت؟**

و-نەخۆشی Toxoplasmia توشی شیردەرەکان دەبیت. بەهۆی جۆری لە پرۆتۆزوادا کە پیی دەوتریت تۆکسۆپلازما گۆندی.

**پ٢/کەی دۆزرایەوە؟**

و-پرۆتۆزوای تۆکسۆپلازما یەکەم جار لە سالی ١٩٠٧دا ناسراوە. و لە سالی ١٩٢٣ یەکەم نەخۆش لە ئادەمیزاد بە تۆکسۆپلازما تۆمارکراوە. لەسالی ١٩٦٧ دا زانراوە کەپشیلە رۆڵی لە بڵاوبونەوەی تۆکسۆپلازمادا هەیە.

**پ٣/ریگاکانی چونە ژورەوەی کامانەن؟**

و-ریگای چونە ژورەوەی تۆکسۆپلازما.. بەهۆی خواردنی گۆشت یان مۆخی ئاژەلیك کە توشی تۆکسۆپلازما بووبیت.. و کە پشیلە گۆشتیك دەخوات لەم تۆکسۆپلازمایەی تیدابیت.. کیسەی تۆکسۆپلازما لە ریخۆڵەیدا جیگیر دەبیت، و لەگەڵ پیسایيدا فریٚ دەدریتە دەریٚ.. و ئەم کیسانە کە تۆکسۆپلازمای تیدایە بەهۆی ئاو یا خۆراکی پیسەوە دەچیتە لەشی مرۆڤەوە. و لەشانەکانی لەشدا پەرە دەسەنیت تا شانەی لەش دەتەقینیت و بڵاودەبیتەوە و لەریگای خویندا بۆ هەموو بەشەکانی لەش وەك میشك و ماسولکەکان و دڵ و سیەکان و ئەگەر دایك لەم کاتەدا سکی هەبیت ئەوا تۆکسۆپلازماکە لە ویلاشەوە (پلاسینتا)

دەچێتــە لەشــی کۆرپەلەکــەوەو بەلەشــی کۆرپەلەکــەدا بڵاودەبێتەوە بۆ مێشکی و چاوی و بەشەکانی دیکەی لەشی و لە ئەنجامی ئەمەدا منداڵەکەی لەبار دەچێت، یان لە دواییدا منداڵەکەی بە مردویی دەبێت، یان منداڵەکە نیشانەکانی نەخۆشی تۆکسۆپلازمای تێدا دەبێت، یان منداڵەکە لە دایك دەبێت هیچ نیشانەی تێدا دیار نیە، و ئەم منداڵانەش لە دواییدا لە ژیاندا کێشەی نەخۆشیەکانی چاویان دەبێت و هانا بۆ پزیشك دەبەن.

**پ٤/ نیشانەکانی کامانەن؟**

و/١-نیشــانەکانی تۆکســۆپلازما..لــە منداڵــی تــازە لەدایك بودا:

کــە لــەدایك دەبــن چــاو و سەریان بچکۆلەیە و تایان هەیەو پەرکەم دەیان گرێت و گەورە نابن و مێشــکیان پــەرە ناســەنێت. سپڵ و جگەریان گەورە دەبێت و دوای چــەند مــانگێك.. پەڵــەی کلسی لــە ئەشــعەی ســەریانا دەردەکــەوێت و شــیکاری خوێنەکانیان تیایدا دەردەکەوێت

که توشی نەخۆشیەکە بووەو وردە وردە بەرەو مردن دەڕۆن.

٢-لە نەخۆشی تەمەنەکانی دیدا.. نیشانەکانی وەك تاو گــەورەبونی ڕژێنــی لیمفــە ڕژێنــەکان دەردەکــەون و ڕەنگــە نیشـانەی هــەوکردنی جگــەر و ماسولکەی دڵ و مێشــکیش تێیدا دەربکەوێت و شیکاری خوێن پیشانی دەدات کە لەش بەرگری تۆکسۆپلازما تۆمار دەکات.

٣-هەوکردنی تۆڕی چاو بە تۆکسۆپلازما:

ئەمە لەتەمەنی ٢٠-٣٠دا دەردەکەوێت..و بە تایبەت لەو نەخۆشانەدا کە لە کۆرپەلـەییدا توش بوون بەڵام لەکاتی لە دایك بوندا نیشانەی نەخۆشیەکەیان پیشان نەداوە.. و ئـەم نەخۆشــانە وردە وردە، بینینیــان دادەبــەزێت و شــیکاری خوێنەکــەیان بەسســتی پیشــانی دەدات کــە هۆکــەی تۆکسۆپلازمایە.

٤-تۆکسۆپلازما لەوانەی کـە سیسـتەمی بـەرگرییان بـێ هێزبوە بـەهۆی نەخۆشـی ئـەیدز Aids یـان شـێرپەنجە یـان وەرگرتنــی هــەندێك داو و دەرمــان کــە توانــای سیســتەمی بەرگری دادەبەزێنێت.. ئەمانە بەقورسی توشی تاو، هــەوی مێشك، هـەوی سیەکان و هـەوی ماسولکەی دڵ دەبـن ئەگـەر فریایان نەکەویت بە پەلە بەرەو مردن دەڕۆن.

**پ٥/چۆن نەخۆشیەکە دەست نیشان دەکرێت.؟**

و-١-نیشــــانەکانی ٢-شــــیکاری خوێـــــن ٣-دەستنیشـانکردنی پرۆتـۆزوا لــە هــەر سـامپڵێك لــە لــەش وەرگیرابێت.

لە شیکاریان تاقیکردنەوەی ڕەنگ یـا کۆمپلیمنیـت یـان شـیکاری بریقـەداری بـەرگری پیشـانی دەدات وپشــتگیری دەست نیشان کردنی نەخۆشیەکە دەکەن.

**پ٦/چارەسەرکردنی چۆن دەبێت؟**

بـەدەرمانی (پـایری میسـامین+ سـلفادایزین) بۆچـەند مـانگێك لەگەڵ فولیك ئەسید.

بــۆ ژنــی ســك پــڕ.. سپایرامایسین.. گەر نەخۆشەکە ڕازی نــــەبو منداڵەکــــەی لەباربرێت.

..لـە کۆرپەلەکـەدا - ٨-١٢مـانگ چارەسـەر دەکرێـت بـە پایرمینانین و سلفادایزین.

لــە نەخۆشـیەکانی تـۆڕی چـاو بـەهۆی تۆکســۆپلازما، پایرمینــاین + ســادایزین+ فولیـك ئەسـید و کورتـیزون لــە هەمان کاتدا.

**پ٧/ ڕێگاکانی خۆپاراستن کامانەن؟**

-هۆشیاری لـەبارەی خواردنـی گۆشـتی مـەڕ و مانگـا.کـە باش بکوڵێنرێت، تا ئەوکیسانەی تۆکسۆپلازما .. بنـەبڕ بـن لە مرۆڤدا دروست نەبنەوە.

-جـێ دەم و پــێ و مانــەوەی پشـیلە دوور لــە قــاپ و قاچاغێك کە لەناو ماڵاندا بەکاردێت بۆ بنبڕکردنی توش بوون بە پرۆتوزوای تۆکسۆپلازما.

-ئومێد دەکرێت کوتاندنیش لـە چەند ساڵێکی ئایندەدا دروست بێت بۆ خۆپاراستن لە تۆکسۆپلازما.

# گەیاندنە فەزاییەکان لە سەدەی نوێدا

پەرچەڤەی: هاوبیر

زاناکان مژدەی ئەوە دەدەن کە ئەم سەدەی (٢١) هەمە شۆڕشێکی گەورەی وا بەخۆوە دەبینێت لەبواری گەیاندنە فەزاییەکاندا دەبێتە هۆی گۆڕانی چەمکەکان لەژیانی مرۆڤایەتیدا بەشێوەیەکی ڕیشەیی لەماوەی دوو دەیەی داهاتوودا، خزمەت گوزاریەکانی وەك فێربوون و تەندروستی و ئەوانی دیکە بەهۆی گەیاندنە خێراکانەوە بەو پەڕی خێرایی و چوستی بەرزەوە بەجێ دەهێنرێت. تۆڕی زانیاریەکانیش بەرەو ئاسۆیەکی دووترو گشتگیری تر بڵاودەبنەوە، و هەموو بوارەکانی بازرگانی و پیشەسازی و زانستی و کشتوکاڵی و کات بەسەربردن دەگرێتەوە، لەماوەی (٥) ساڵی داهاتوودا تۆڕەیەك لە مانگە دەستکردەکان کە ژمارەیان دەگاتە (١٠٠٠) مانگ بە دەوری زەویداو لە خولگەی جیاجیا بڵاو دەبنەوە، هەندێکیان لە خولگە نزمەکان دا(LEO) کە بەرزاییان لەچەند سەد کیلۆمەترێك تێپەڕناکاتو، هەندێکی دیکەیان لە خولگە

بەرزەکاندا (GEO) کە بەرزاییان دەگاتە (٣٦٠٠) کم و بەخولگەی جێگیری هاوکاتی دەناسرێن دادەنرێن، ئەو مانگە دەستکردانەی کە لە خولگە نزمەکاندا دادەنرێن بەوە لە مانگەکانی دیکە جیا دەکرێنەوە کە لەماوەیەکی پێوانەییدا لە (١/١٠٠چرکە تیپەڕ ناکات) نیشانەکان وەردەگرێت و دەیانێرێتەوە، بەڵام ژمارەی ئەو مانگانەی کە لەو خولگەیەدا دادەنرێن پێویستە بکاتە (٥ تا ٢٠) هێندی مانگە دەستکردەکانی خولگەی جێگیر (GEO) زاناکان لە هەوڵی ئەوەدان کە سود لە خولگە ناوەندیەکان (MEO) وەربگرن و چوستی مانگەکان لەو خولگەیەدا زیاد بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش لەجیاتی مانگی دەستکرد، فڕۆکەی ڕووتەختی تایبەتی لە بەرزایی (٢٠٠٠٠م) لەڕووی زەویەوە جێگیر دەکەن بە جۆرێك کە ئەو فڕۆکانە بۆ ماوەیەکی زۆر لەو بەرزاییانەدا بمێننەوەو بێ فڕۆکەوان بن و لە زەویەوە بەشێوەیەکی ئەلکترۆنی کۆنترۆڵ

دەکرێن و نیشانەکان وەردەگرن و زۆر بەخێرایی دەیانێرنەوە. ئەوەی ئەو تەکنۆلۆژیا نوێیە لەوانی دیکە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ زانیاریەکان دەگاتە بەکارهێنەر بەبێ ئەوەی پێویست بکات زانیاریەکان لە فەزاوە لەلایەن بنکە زەمینیەکانەوە وەربگیرێن و ئینجا ئاراستەی بەکارهێنەرانی بکرێن. توانای مانگە دەستکردەکانی سەدەی (٢١) هەم دەیان جار زیاتر دەبێت لە مانگە دەستکردەکانی ئێستا، ئەوەش بە بەکارهێنانی سیستمێکی نوێ کە تیایدا ریشاڵی بینایی بەکاردەهێنرێت و، کە دەتوانرێت پەیوەندی بە مانگە دەستکردەکانەوە هەبێت و لە هەمان کاتیشدا شوێنی فرۆکەکان و کەشتیەکان و جووڵەکانیان پەیوەست بن بەو مانگە دەستکردانەوە، چونکە توانایی ئەو مانگانە بە (١٠٠-١٠٠٠) جار زیاتر دەبێت لەوانەی ئێستا.

### ریشاڵە بیناییەکان:

وولاتە پیشەسازیە گەورەکان هەردەم لە هەوڵی ئەوەدان کە ئەو توانا زۆرەی ریشاڵە بیناییەکان بەکاربهێنن لە فراوان کردنی خزمەتەکانی گەیاندن و، گواستنەوەی زانیاری بە چەندین جار زیاتر لەو زانیاریانەی ئێستا، ئەوەش لە میانەی ئەو مانگە دەستکردانەی کە لەسەر خولگەی جیاجیاوە بەدەوری زەویدا دەسوڕێنەوە، بەڵام زاناکان لەوە دەترسن کە لە داهاتوودا ئەو خزمەتە زۆرو جۆراو جۆرەی بواری گەیاندنەکان ببێتە هۆی تێک چوون و بەیەکدا چوونی خزمەتەکان کە لە ڕێگای مانگە دەستکردەکان و بێ تەلیەکان و ریشاڵە بیناییەکان و کێبڵە زەمینیەکانەوە پێشکەش دەکرێن، بۆیە پێویست دەکات پەیوەستنامەو برۆتۆکۆل ئیمزا بکرێن لەنێوان دەوڵەتەکاندا بۆ ڕێکخستنی ئەو خزمەتانە، و گواستنەوەی زانیاریەکان بەو پەڕی توانست و چوستیەوە. هەروەها بۆ زیاتر دابین کردنی داخوازیەکان سەدەی نوێ، ئەندازیارەکان لە هەوڵی ئەوەدان کە مانگی دەستکردی وا دابهێنن ئاسۆی کارکردنی فراوانتر بێت و پشت ببەستێت بە ریشاڵە بیناییەکان و کێبڵە زەمینیەکان لە یەک کاتدا، ئیتر خزمەتەکان زیاتر دەبێت و خێرایی گەیاندنیشیان بە بڕی (١٠٠٠) جار زیاتر دەبێت لەوانەی ئێستاو، شارەزایان دەڵێن کە ئەو جۆرە خزمەتانە وا لە کۆمپانیاکان دەکات کە گەیاندنی تەلەفۆنی وا دابین بکەن کە زۆر هەرزان بێت و نرخی یەک خولەک قسەکردن لە (٠,١) سێنت تێپەڕناکات، و خزمەتەکانی تەلەفزیۆنیش بەهەمان شێوە بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە فراوان بوون و پێشکەوتنی گەورە بەخۆوە دەبینن.

مۆبایلی چوستی بەرز بەهۆی ووزەی خۆرەوە: جیهانی ئەمڕۆ بەرەوبەکارهێنانی مۆبایلی زۆر بچووک دەڕوات کە لە وەرگرتن و ناردنەوەی زانیاریەکاندا پشت دەبەستێت بە ئەنتێنایەکی بچووک کە نیشانەکان وەردەگرێت و زۆر بەوردی دەیانێرنەوەو، ناکرێت ئەو دەستکەوتەش بەدی بهێنرێت بەبێ ئەوەی چوستی کارکردنی مانگە دەستکردەکان بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەوەی مانگە دەستکردەکە بتوانێت مامەڵە لەگەڵ ئەو نیشانە لاوازانە بکات کە لە ئەنتێنا بچووکەکەوە دێت، بۆ ئەو مەبەستە پێویستە سیستمێکی تایبەتی لە ووزەی خۆری دروست بکرێت لە مادەکانی گالیوم ئەرسینەدو جرمانیۆم لە جیاتی مادە سلیکۆنیەکان، بەو شێوەیە زاناکان وا چاوەڕوان دەکەن کە چوستی ئەو مانگانە بەڕێژەی (٣٠٪) بەرزبێتەوە ئەگەر ئەنتێنای گەورەی تیرە (١٠) م بگاتە (٢٠، ٣٠) مەتری لەسەر ئەو مانگانە ببەسترێن، هەتا توانای وەرگرتنی زانیاریەکانی زیاد بکات و بەخێرایی وەڵامی هەزاران داواکردن بداتەوە لە یەک کاتدا، شارەزایان وای بۆ دەچن کە بەهۆی ئەو سیستمە نوێیەوە بتوانرێت نیشانەکان وەربگرێت و بیانگێڕێتەوە بۆ (٢٧٠٠٠) ئەنتێنای بچووک لە یەک کاتدا، تاسیستمی گشتگیری لە خزمەتەکانی گەیاندندا بەدی بێت و خزمەتەکان بگەنە هەموو شوێنەکان بەو پەڕی کەم تێچوون.

زاناکان بەچاوێکی زۆر گەشبینەوە سەیری دوا ڕۆژ دەکەن بەو هیوایەیکە بتوانن تۆڕەکانی گەیاندن زیاتر

گشتگیری ترو هەرزانتر بکەن، بۆ ئەوەش مانگی دەستکردی وا دورست دەکەن کە بەرەو فەزا بنێرێت و دایبگرنە خوارەوەو بۆ پشکنین کردنی و جارێکی دی بەرنامە ڕێژکردنی و ناردنەوەی بۆ فەزا، ئەو تەکنۆلۆژیا دوا ڕۆژیە کە زاناکان پلانی بۆ دادەڕێژن خۆی لە میانەی چوار پرۆژەدا دەبینێتەوە:

١-ناردنی کەشتی فەزایی کە بە گازی هیلیۆم کاربکات و رۆبۆت بەرێوە بیبات.

٢-مانگە دەستکردەکان بە ووزەی خۆر کاربکەن.

٣-ئیش پێکردنی کەشتیە فەزاییەکان لە سەر شێوازی ئیش پێکردنی فرۆکە.

٤-ناردنی مانگە دەستکردەکان بەهێزی هەڵدانی ڕاستەوخۆ.

لە جۆری یەکەم و دووەمدا تواناو ووزەیەکی زۆر هەیە بۆ ئەوکەشتی و مانگە دەستکردانە کەدەتوانن ماوەیەکی زۆر لە فەزادا بمێننەوە بەڵام دووجۆرەکەی دی ئەو سیفەتە باشەیان نیەو ناتوانن لە چەند رۆژێك زیاتر خزمەت لە فەزادا بکەن. هەروەها بیرۆکەی پرۆژەی داهاتوویی زیاتر لە ئارادایە تا خزمەتەکان فراوانتر بکات لە بواری گەیاندندا بۆ ئەوەش پشت دەبەسترێت بەزیادکردنی لەرەلەری شەپۆلەکان تا ئەوپەری توانا، بەڵام ئەمەیان گرفتی ئەوەی لەبەردەمدایە کە شەپۆلەکان بەر دڵۆپە بارانەکان دەکەون لە ڕێرەوەکانیان لادەدەن، بۆیە پێویستە بنکەی زەمینی زیاتر هەبن تا ڕێرەوی ئەوشەپۆلانە ڕاست بکەنەوەو ئەوەش تێچووی زیاتری دەوێت. ئێستاش هەوڵی زۆر لە ئارادایە کە تیشکی لەیزەر بەکاربێنن لەبواری گەیاندنەکاندا بەڵام هەوڵەکان لە قۆناغی سەرەتایی دەرنەچوون.

تەماعی زاناکان بۆ (٢٠) ساڵی داهاتوو بێ سنوورە، کە دەیانەوێت هەموو ووزەکان بخەنە گەڕ بۆ خزمەتی زیاتر و خێراترو فراوانترو هەرزانتر لە بواری گەیاندنەکاندا هەروەك گۆڤاری (American Scientist) نووسیویەتی، بێ گومان ئەوەش پێویستی بەهەوڵی هەموو زانکۆو پەیمانگاکانی جیهان هەیە بۆ ئەوەش پێوستە پەیمانگایەکی زانستی جیهانی دابمەزرێت کە تایبەت بێت بەوکارە.

## دەرمانی ستاتین
## بۆ نەخۆشیەکانی دڵ

توێژینەوەیەکی نوێ دەری خست کە لە توانادا هەیە ژیانی هەزارەها نەخۆشی دڵ لە بەریتانیا بپارێزرێت ئەگەر هاتوو یەکێك لە دەرمانەکانی نەخۆشی دڵیان بەشێوەیەکی فراوان بۆ دابین کرا.

هەندێك نەخۆشی دڵ دەرمانی ستاتین بەکاردەهێنن بۆ تووش نەبوون بە سەکتەی دڵ ئەگەر ڕێژەی کولیسترۆڵ لە خوێنیاندا بەرزبوو، بەڵام توێژینەوەیەکی نوێ دەریخستووە کە کۆمەڵێکی زۆر لە نەخۆشەکانی دڵ دەتوانن سوود لەم دەرمانە ببینن بۆ خۆ پاراستن لە سەکتەی دڵ، هەروەها لەکاتی بەکارهێنانی ئەم دەرمانەدا دەتوانرێت ژیانی ١٠ هەزار نەخۆش لە جیهاندا بپارێزێت. لەگەڵ ئەوەی توێژینەوەکە ساڵی پار ئەنجام درا بەڵام ئەنجامەکەی لەم ساڵدا خرایە ڕوو ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پزیشکەکان زیاتر ڕوو لە پێدانی ستاتین بەنەخۆشەکان بکەن، بەڵام ئەمە لە رووی ئابوریەوە زۆری تێدەچێت. چونکە دەرمانەکە ڕۆژانە یەك جنیهی ئسترلینی تێ دەچێت بۆ نەخۆش، کە ئەم تێچونە زۆر زیاترە لە تێچونی ئەو دەرمانانەی ئێستا بەکار دەهێنرێن بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام توژەرەوە پزیشکیەکان دەڵێن پێویستە ئەوە بەپزیشکەکان بووترێت کە حەپەکانی ستاتین بەکاربهێنن بۆ سودێ وەرگرتن بەخێرایی.

ریچارد هورتون، سەرنووسەری گۆڤاری لانسیت کە ئەنجامی توێژینەوەکەی بڵاوکردەوە دەڵێت: (( ئەمە گرنگترین ئەو ئەنجامانەن کە لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەدا لەبواری چارەسەری سەکتەی دڵ و خۆپاراستن لێی پێی گەیشتووین، هەروەها وتی : ((پێویستە بەهۆی ئەنجامی ئەم توێژینەوەیەو، گۆڕانکاری بەرفراوان لە هەموو جیهاندا لەبواری چارەسەرکردنی سەکتەیدڵ و خۆپاراستن لێ دا بهێنرێتە گۆڕێ.

پروفسیور رودی کولینز لە زانکۆی ئوکسفورد دەڵێت: ئەم ئەنجامانە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم دەرمانە بەشێوەیەکی باش سودی لێوەردەگیرێت، کە دەتوانرێت کۆمەڵێکی زیاتر سودی لێوەربگرن زیاد لەوەی کە ئێمە وامان دەزانی، دەتوانرێت نەخۆشانی زیاتر سود لەم حەپانە وەربگرن کە ژمارەیان دەگاتە چەند ملیۆنێك لە هەموو جیهاندا.

سیرجورت رادا سەرۆکی ئەنجومەنی توێژینەوەی پزیشکی لە بەریتانیا ووتی: ((بەهۆی ئەم توێژینەوەیە کە بڕی تێچونەکەی ٢١ ملیۆن جنیهی ئسترلینی بوو، توانیمان بارودۆخی دروستی هەمەڕەنگ و فراوان بۆ ئەو نەخۆشانە دیاریبکەین کە بتوانن سود لە دەرمانی ستاتین وەربگرن. ئێستا پێویستە بەریتانیا چەند ملیۆنێك جنیهی دیکە تەرخان بکات بۆ تێچوونی دروستکردنی دەرمانی ستاتین.

# پاشماوە ژەهراویەکان و سەودا نامە گومانلێکراوەکان

لوقمان جەمال

ئەو کۆمپانیا خۆرئاواییە چالاکانەی کە لەبواری ئەمبارکردنی پاشماوە ژەهراوییەکاندا کاردەکەن، هەژاری هەندێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دەقۆزنەوەو چەند سەودانامەیەکی گومانلێکراویان لەگەڵدا دەبەستن، کە بەگوێرەی ئەو سەودانامانە وڵاتانی هەژار ئامادەن ئەو پاشماوانە لە خۆ بگرن، لەبەرامبەر بڕێك پارەی کەمدا، بەبێ گوێدانە ئەو مەترسییانەی کە لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە کورت بینەوە ڕوودەدات، نەك تەنها لەسەر ئەو وڵاتە هەژارانە، بەڵکو سەرتاسەری هەسارەی زەوی دەگرێتەوە.

بەم دواییەش هەواڵێك سەبارەت بەو کەتن و هەرایە بڵاوبووەوە کە پەیوەندی بە ئەمبارکردنی پاشماوە تایبەتەکانەوە هەبوو لە هەندێك وڵاتانی جیهانی سێیەمدا.

ئەو کەتن و هەرایەش مێژوویەکی پێشتری هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ڕابردوو، بۆ نموونە ئەوکاتە ڕۆژنامە خۆرئاواییەکان لە ساڵانی ناوەڕاستی حەفتاکاندا باسیان لەوە دەکرد کە سەرۆکی میسری لەوکاتەدا ئامادەی خۆی نیشان دابوو، بۆ ئەمبار کردنی پاشماوە تیشکدەرە خۆر ئاواییەکان لە بیابانەکانی میسردا، بێگومان سەرۆکی پێشووی میسر هەوڵی دابوو بەو جۆرە سۆزی جیهانی خۆرئاوا بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بەتایبەتی کە بە نیازی وتووێژی قورس بوو لەگەڵ لایەنی ئیسرائیلیدا، ئەو هەنگاوەی سەرۆکی میسر بووە هۆی ورووژاندنی ڕای گشتی میسری لەو کاتەدا، لەو کاتە بەدواوە سەرۆکی میسری داواکەی نەخستەوە ڕوو.

لێرەدا ویستم ئاماژەیەك بەوە بدەم کە کێشەی ئەمبارکردنی پاشماوە تایبەتەکان لە ئێستادا سەری هەڵنەداوە، بەڵکو لە ساڵانی حەفتاکانەوە دروست بووەو پەرەی سەندووە، لە ئەنجامی پێش کەوتنی پیشەسازی وڵاتانی دەوڵەمەندەوە کە لەم ساڵانەی دواییدا زیاتر گەشەی کردووە، ئەگەر بمانەوێت قەبارەی پاشماوەی ئەو وڵاتانە بزانین، ئەوا پێویستە مەودای پێشکەوتنی پیشەسازییان بزانین.

لەڕاستیدا قەبارەی پاشماوەی وڵاتە پیشەسازییە دەوڵەمەندەکان سەران و حکومەتەکانی ئەو وڵاتانەی نیگەران کردوە، هەمیشە پرسیار لەبارەی ئەوەوە دەکرێت کە ئایا ئەو بڕە زۆرەی پاشماوەکان بەرە کوێ دەچێت؟

تـــاوای لێــهات ســـەبارەت بەکێشـــەی پاشماوەکـــان سەودانامەو زیادکردنەکانو گریّ بەندە نێو دەوڵەتیەکان بە ئـەنجام بگەیـەنرێت، ڕێککەوتننامەیــەك لـەنێوان حکومــەتی ئەڵمانیای خۆرئاواو حکومەتی فەڕەنسیدا مۆرکرا کە هەردوو دەوڵەت پاشماوە تیشکدەرەکانیان بەیەکەوە ئەمبار بکەن بۆ ماوەیــەکی کــاتی لەهــەر یــەکێك لــەو دوو وڵاتــەو پاشــان بگوێزرێتـەوە بۆ وڵاتەکەی دیکـەیان، بەڵام تـا ئـەمڕۆش ئـەو پاشماوە تیشکدەرانە کە لە خاکی فەرەنسادا ئەمبار کراون، هەر لەگەڵ ئەوەی کاتی گوێزانەوەی بۆ خاکی ئەڵمانیا دێت، بازاڕەکانی سازشکاری لـەنێوانیاندا گەشـە دەکـاتو هـەموو جارێك ئەڵمانیا بەوە ڕازی دەبێت کە بڕێك پارەی زیاتر لەوەی پێشــووتر بــدات بــە فەڕەنســا لەبەرامبــەر مانــەوەی ئــەو پاشماوانە کە لـەخاکی فەرەنسـادان، بـەم دواییـەش روسـیا هاتۆتە نێو ئەو سەوداکارییەوەو پێشنیارێکی لەمانگی ئابی ڕابردوودا پێشکـەش بـە ئـەڵمانیا کـردو ئامـادەبوونی خـۆی ڕاگەیاند بۆ ئەمبارکردنی پاشماوە تیشکدەرەکانی ئەڵمانیا، لەبەرامبەر بڕێك پارەدا، تا ئێستاش ئەو پێشنیارەی ڕوسیا لەلایەن ئەڵمانیاوە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت.

پاشمــاوە تایبەتــەکان گوزارشـــتێکی نوێیــە، لایەنــە پـەیوەندارو گرنگــی پێدەرەکـانی ژینگـە بـەکاری دەهێنــن، مەبەستیان جۆرێکە لـەو پاشماوانـەی کـە مەترسییان هەیـەو

دوو تایبەتمەندێتی سەرەکیان تێدایە، یەکەمیان ئەوانـەی کە هەمەگیرنو شیکاری بایۆلۆژییان تێدا دژوارە یان ئەوانەی کە زۆر بەهێواشی شی دەبنەوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژینگەدا کەڵەکە دەبنو دووەمیشـیان ئـەو پاشماوانـەی کـە مـادەی ژەهـری زۆریان تێدایەو دەبێتە هۆی نەخۆشی و مردن ئەگەر چووە نێو جەستەی مرۆڤو گیانەوەرانەوە.

هەر بۆیە پێویستە زۆر بەووریاییەوە هەوڵی لەناوبردنی ئەو پاشماوە تایبەتانە بدرێت، ئەگەر ڕاستەوخۆ فڕێ درایە نـاو ژینگــەوە ئــەوە لــەداهاتوودا دەگاتــە ســەرچاوەکانی خواردنو خواردنەوەوەو پیس بوونیان هۆکارێکە بۆ دروست بوونی کارەسات.

زۆربەی پاشماوە تایبەتەکان تیشکدەر نینو کـەمێکیان تیشکیان لێ دەردەچێت، بەڵام پاشمـاوە ناتیشکدەرەکان لـە ئــەنجامی گــەڕان بــەدوای کانزاکــاندا لــەنێو کانــەکاندا (کنــەکردن)و چـارکردنی تـۆڕی ئاوەڕۆکـان بەرهــەم دێــنو هـەروەها لـە پاشمـاوەی بینـاکردنو لەکارگـەکانی دروسـت کردنی مادەی کوژەری گژوگیاو مێروەکانو دروست کردنی بۆیاخ پەیدا دەبن. ئامادەکردنی لیستێکی لەم جۆرە ئەستەمە ئـەویش لەبـەر دوورودرێـژی و زۆری ئـەو مادانـەو پاشمـاوە تیشـك دەرەکــان بەمەترســیدارترین پاشمــاوە تایبەتــەکان دادەنرێــن، لەبەرئــەوە درێــژە بــە قســەو باســەکان لــەو بارەیەوە دەدەین.

بەشێوەیەکی سروشـتی گـۆی زەوی بڕێکـی لـە کـانزای تیشکدەر تێدایە، بیکاریلی زانای فەرەنسی لە ساڵی ١٨٦٩دا بـۆ یەکـەم جـار دیـاردەی تیشـکدانەوەی لــە کەرەسـتەیەکی خاودا کـە مـادەی ڕادیۆمـی تێدایـە دۆزیـەوە، تیشـکدانەوە شـێوەیەکە لـە شـێوەکانی ووزە، تەنـها بـە ڕاگـەیاندنی ئـەم دۆزینـەوە نوێیـە، زاناکـان هەوڵـەکانی خۆیـان خسـتەگەڕ بـۆ لێکۆڵینـەوە لەسـەر شـێوەی سـوود وەرگرتـن لــە وزەی ئــەو تیشـکدانانەوە، هـەر بۆیـە شتێکی سروشتی بوو کە زانایـان گرنگیو بایەخـەکانیان لـەم بارەیـەوە چڕکـردەوە تـا بتوانـن کانزا ناتیشکدەرەکانی سەر زەوی بگۆڕن بۆ کانزای تیشکدەر کە هەسارەکەی ئێمە بڕێکی کەمی تێدایە، خاتوو کوری زانای فەرەنسـی لەمیانـەی ئامـادەکردنی لێکۆڵینەوەکـەیدا، لەبـەر تیشکانەوە کەوتو گیانی لەدەست دا، ناوبراو یەکەم کـەس بوو کـە لەبەرهـەم هێنـانی کـانزای تیشـکدەر لـە کـانزای نـا

تیشکدەر لە سالی ١٩٣٤دا سەرکەوتوو، لەو کاتە بەدواوە بری مادە تیشکدەرەکان بەردەوام لە هەسارەکەماندا لەزیاد بووندان. خاتوو کوری سەرکەوتوو بوو لە گۆرینی کانزای بۆرۆنی ناتیشکدەر بۆ نایترۆجینی تیشکدەر بە لیدانی گەردیلەکانی کە پیّی دەوتریت گەردیلەکانی ئەلفا، ئەم گۆرانە وا بەستەیە بە گواستنەوەی نیوترۆنیك لە هەر گەردیلەیەکی بۆرۆندا، بەبیّ ئەوەی کەس سروشتی کارلیکە ئەتۆمیەکانی بەهیند وەربگریت کە لەم جۆرە کارانەوە دروست دەبیت، دەزانین کە کارلیکی ئەتۆمی خاوەنی سروشتیکی زنجیرەییە، بەواتای ئەوەی کە بەرهەمەکانی ئەو کرانە، بەشیوەیەکی خودی کارلیکی نویّ دروست دەکەن، یان باشتر وایە بلیین بەرهەمی ئەم چارەکردنە کارلیکی نویّ بەشیوەی خۆی بەرهەم دینیت بەوشیوەیە یەك لەدوای یەك روودەدات، ئەو نیوترۆنەی کە لە ئەنجامی ئەو کارلیکەوە ئازاد دەبیت، هەروا بەسستی ناوەستیت هەروەك لە زۆربەی کارلیکە ئاساییەکاندا دەیبینین، بەلکو بەخیرایی گەردیلەی نوێی تیشك دەرو نا تیشکدەر بەرهەم دینیت‌و کانزای نویش بەرهەم دینیت‌و هەروەها بریکی زۆریش لەنیوترۆن‌و وزە ئازاد دەکات، هەموو جاریکیش نیوترۆنە ئازادکراوەکان بەشیوەیەکی بەهیز تر کاری خۆیان ئەنجام دەدەن‌و لەگەڵ ئەوەشدا بریکی نویّ وزەی شاراوە لە گەردیلەکانەوە ئازاد دەبن.

خۆ ئەگەر مرۆڤ نەیتوانی کۆنترۆلی ئەو وزەیە بکات‌و لیگەریت لە ژینگەدا کاری خۆی بکات، ئەوا ئەو وزەیە دەبیتە هیزیکی ویرانکەری تیکەلکراو هەر ئەوەش بنەمای زانستی بیرۆکەی دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمیە، بەلاّم ئەگەر مرۆڤ توانی کۆنترۆلی ئەو وزەیە بکات، بەشیوەیەکی ریك‌وپیك‌و بەتیکرایی لەسەرخۆ ئاراستەی بکات، ئەوا دەتوانیت ئەو وزە ئازادکراوە ئەمبار بکات‌و بگۆردریت بۆ شیوەیەکی دیکە لە وزەی ئازاد نەکراو، ئەوەش بریتیە لەو بنەماو بناغەیەی کە کارلیکە ئەتۆمیەکان پشتی پیدەبەستن لەپیناو گۆرینی وزەی تیشکدار بۆ کارەبا.

ئەوەی لیرەدا بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە ئەو هەموو پراکتیزەکردنانە کە بوونەتە کاری رۆژانە لە ژیانی مرۆڤی هاوچەرخدا، ژمارەو بریکی زۆر لە پاشماوە تیشکدەرەکان دەردەدەن.

پیویستە خۆ رزگارکردن لە پاشماوەکان بەجۆریك بیت کە مرۆڤ و ژینگە لە مەترسییەکانی بەدوور بیت کە مەترسییەکی ئیجگار زۆری هەیە هەر لەم باسەماندا کورتەیەك سەبارەت بە مەترسییەکانی تیشکدانەوە لەسەر مرۆڤ دەخەینە روو لەوانەی هیرش دەکەنە سەر هەموو بەشیکی جەستە بەبیّ جیاوازی و خرۆکە سپییەکان تیك دەشکینیت بەوەی کە زیان بەمۆخی ئیسك دەگەیەنن کە بەر هەم هینەری خانەکانن هەروەها سپڵ‌و گریّ لیمفاوییەکان تیك دەشکینن‌و دەبنە هۆی شیرپەنجەی سییەکان‌و شیرپەنجەی پیست‌و دەبنە هۆی نەزۆکی‌و شیواندنی کۆرپەلەو گۆرینی هۆکارە بۆماوەییەکان‌و زۆر جاریش دەبنە مایەی مردن بەئیش‌و ئازاریکی زۆر لەسەر ئەو ئاماژە پیّ کردنە کورتانە کە لەبارەی تایبەتمەندیتی پاشماوە تیشکدەرو ناتیشکدەرەکانەوە خستمانە روو، خوینەر دەتوانیت شیوازی مامەلەکردن لەگەلیاندا بەدەست بهینیت، ئەویش لەبەر رۆشنایی نەخشەیەکی ووردو تاوتویّ کراو، لەبەرئەوە پیویستە لەسەرمان چارەسەری ئەو پاشماوانە بەجۆریك بیت کە خۆمان لەو خەتەرە کوشندەیە بپاریزین، ئەو شیوازەش لەراستیدا کاریکی تەکنەلۆژی بەرپاو سەربەخۆیە.

ئەو تەکنەلۆژیایەش تەنها چەند دەولەتیکی دیایکراو لەو ولاّتە پیشەسازییە دەولەمەندەکان هەیانە، ریگەی رەچاوکراو بەشیوەی یاسای بۆ رزگاربون لەو پاشماوانە بەچەند جۆریك دەبیت لەوانەش گۆرینی بۆ شیوازی رەق، پاشان جیگیرکردنی لەقولاّیی زەویدا لە چینی جیۆلۆجیدا بە ووشکی‌و جیگیری ناسراوەو باشتریشە ئەگەر ئەو زەوییە بەخویّ دەولەمەند بیت، بۆ دلنیابوونی زیاتر لەوشکیەتی بەدریژایی دەیان هەزار سالّ، هەندیك لەدامەزراوەکان بۆ دلنیایی زیاتر بەر لەخستنە نیو قولاّیی زەوییەوە، ئەو پاشماوانە بەچیمەنتۆ یان مادەیەکی دیکەی لەو جۆرە رووپۆش دەکەن، دیارە ئەمەش واتا ئەم تەکنۆلۆژیایە خەرجیەکی زۆری دەویت، بەتایبەتی کە بری پاشماوەکان بە بەردەوامی لەزیاد بووندان، بەگویرەی دوا ئامارەکانیش کە سالی رابردوو لە بروکسل بلاّوکرایەوە لەسەر قەبارەی پاشماوە تایبەتەکانی ولاّتانی بازاری هاوبەشی ئەوروپا گەیشتە ١١٠٠ملیۆن تەن لەیەك سالدا، ئەم ژمارەیە دوو ولاّتە

زلهێزە پیشەسازییەکەی جیهان ئەمریکاو ژاپۆن ناگریتەوە، سەرەرای وڵاتانی پیشەسازی بلۆکی خۆر هەڵات لە ئەفریقاش جگە لە هەولی ناخۆش هیچی دی نابیستریت. لەو هەواڵانەش کە پەیوەندی بە وشکە سالی و برسیتییەوە هەیەو هەروەها لافاو و نەخۆشی، سەرەرای هەوالی هەژاریو قەرزە کەڵەکەبوەکان بێگومان وڵاتانی پیشەسازی خۆرئاوا رۆلی سەرەکی لەو کارەساتو مەینەتیانەی کە لە سەدەکانی رابردوودا بەسەر ئەو کیشوەرەدا هاتووە بینیوە لە کارەساتی داگیرکردنو دزینی سامانی سروشتی دا دریغی نەکردووە، خۆرئاوای دەولەمەند تەنها بە بازرگانی کردن بەمرۆڤی ئەفریقی لە بازارەکانی بازرگانی کردن بە کۆیلەکراوەکانو هەرزان فرۆش کردندا کۆلی نەداوە، کەواتە مەینەتیەکانی ئیستای ئەفریقا هەروەکو رابردوو سەرچاوەکەی وڵاتانی دەولەمەندی خۆر ئاوایە، باس لەوەش دەکریت کە ڤایرۆسی ئەیدز لە ئەندازەی بۆ ماوەییدا کە لە تاقیگەکانی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا دیاریکرا شیوازیك بووبیت لە شیوازەکانی جەنگی بایۆلۆژی کاتیك ویسترا لەسەر مرۆڤی ئەفریقی تاقی بکریتەوە ئەمریکا لە کۆنترۆل کردنی نەما، هەرچەندە بەلگە لەسەر راستی ئەو پروپاگەندەیە نیە، خۆ رەنگە ئەوە لەبنەرەتیشدا دروست کراوبیت بەلام ئەوە ریگە لەوەش ناگریت کە لە ناوەرۆکدا راست بیت.

ئیستا لەلای مرۆڤایەتی بەلگەی سەلمینراو بەدەستەوەیە لە نیو گەلانی وڵاتانی پیشەسازی خۆرئاوا لەپیسکردنی کیشوەری ئەفریقا بە پاشماوەکان، لەپیناو دەستکەوتی مادیدا، لە هاوینی رابردوودا زۆر جار رۆژنامەکانی خۆرئاوا ئەو پرسیارەیان دووبارە دەکردەوە سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەفریقا دەبیتە تەنەکە خۆل بۆ وڵاتانی خۆرئاوا؟

ئەم پرسیار کردنەش هاوکات بوو لەگەل دەرکەووتنی ئەو کەتنەی کە چەند کۆمپانیایەکی ئیتالیو بەریتانی و ئەلمانیای خۆرئاوا و ئەوروپای تیوە گلابوو کە بریتی بوو لە رۆکردنی پاشماوە ژەهراوییەکان لە نەیجیریا، ئەمە وای لە کۆمپانیایەکی ئیتالی کردووە کە بەناوی چەند کۆمپانیایەکی دیکەوە ساختەکاری لە ناوەرۆکی ئەو پاشماوانەدا بکات کە دەگاتە نزیکەی ٣٠٠٠ تەن، کە پاشماوەکان مادەی شیرپەنجەییو هەندیك مادەی تیشکدەری دیکەی تیدا بووە، کۆمپانیا ئیتالیەکە بارە ژەهراوییەکەی لە یەکیك لە کیلگەکانی گوندی کوکوری سەر دەریادا رۆبکات، ئەمەش دوای بریك پارەی دابوو بە خاوەنی کیلگەکە لە بەرامبەر ئەنجامدانی کارەکەیدا، تەنانەت کۆمپانیاکە هەولی نەدابوو ئەو پاشماوە ژەهراوییانە لەژیر خاکدا بشاریتەوە، بەلکو لەژیر بارانوشیو بەردەستی منداڵانی گوندەکەدا بەجیی هیشتبوون، کەماڵەکانیش دەیان مەتر زیاتر لەو کیلگە ژەهراوییەوە دوور نەبوون، رۆژنامەکانی نەیجیریا بەشداریان لە پەردە هەلمالینی ئەو کەتنەدا کرد، ئەوەبوو حکومەتی نەیجیریا داوای لە کۆمپانیا ئیتالیەکە کرد ئەو پاشماوانە لە خاکەکەیدا بکیشیتەوە، دەسەڵاتدارانیئیتالیاش هەر دەست بەجیی ئامادەییان راگەیاند، ئەمەش بە ئاگاداری خۆرئاوا بوو، ئەوەبوو کەشتیەکی ئەلمانیای خۆرئاوا نیردرا بۆ ئەو مەبەستە کە ناوی (کارین ب) پاشماوەکانی بەتەواوی لە کوکو کیشایەوە، پیش بینی دەکرا کەشتیەکە بارەکەی لە ئیتالیا بەتاڵ بکاتەوە یان لە هەر دەولەتیکی دیکە کە بەشداربوون لەو مەسەلەیەدا، تا چارەی ئەو پاشماوانە بکاتو بیانپاریزیت بە گویرەی ئەو تەکنۆلۆژیا تیچوە زۆرەی کە پیشتر خۆی لیدەدزیتەوە، بەلام شتیکی لەم جۆرە رووی نەدا و بەلکو کەشتیەکە هەر بە بارەکەیەوە بەردەوام بوو لە گەشتەکەیدا بە ناوی ئاوی دەریای ناوەراست دا، لەم بەندەرەوە بۆ ئەو بەندەر لەگەشت دا بوو، تا لە دوایدا لە یەکیك لە کەنارەکانی ئیتالیا لەنگەری گرت، تا ئیستا لەلایەن

لیپرسراوانی باڵای ئیتالیـەوە لیکۆڵینـەوە لەسـەر چۆنیـەتی ڕۆکردنی ئەو پاشماوانەوە دەکریت لەپیناو چارەکردنیدا لە ئیتالیـا، هـەروەها ئامـاژە بـۆ کەشـتییەکی سـوری بـەناوی زەنوبیاوە کە نزیکەی (١٥٠٠) بەرمیل پاشمـاوەی ژەهـراوی هەڵگرتووە، ئەو کەشتیە ماوەی سالیك لە ئاوەکانی ئەوروپادا مایەوە، بەرلەوەی دەسەڵاتدارانی ئیتالیا ڕیگەی پێ بدەن کە لـە بـەندەری جـەنوە لەنگـەر بگریـت، کـە دوو مـانگی تـەواو چـاوەڕێی کـرد تـا حکومـەتی ئیتالیـا ڕەزامـەندی لەسـەر ڕۆکردنی بەشیك لەوبارە ڕابگەیـەنیت لـە ئیتالیـادا، لـەپیناو چارەکردن و شاردنەوەی لەو وڵاتەدا.

کەتن هەرای پاشماوەکانی نەیجیریا لە کیشوەری ئەفریقا تەنها هەرا نیە، بەلکو ئەوە مشتیکە لە خەرواریك کە تائیستا زۆربـەیان نادیـارن، هەربۆیـە ئـەو کـەتن و هەرایـەی نـەیجیریا هانی ڕۆژنامە نووسان و بایەخ پیدەرانی بەکاروباری ژینگە لە وڵاتانی خۆرئاوادا کە دریـژە بـە کنەکردن لـە گـەران بـەدوای کانزاکان لە کانەکاندا بدەن لیکۆڵینەوەی خۆیان ئەنجام بدەن، تا بەلگەو زانیاری سەرسورهینەر بەدەست بهینن کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کۆمپانیا ئەمریکی و ئەوروپیـەکان گریێ بەسـتیان لەگەڵ نزیکەی ١٧ دەولەتی ئەفریقیدا مۆرکردوە بۆ ڕۆکردنی پاشماوە تایبەتەکان.

ئەو کۆمپانیایانـەش چەند کاریکی نایاسایيان کـردووە، دوای ئـەوەی پـەردە پۆشـیکی دروسـت کراویـان بـەناوی یاسـاییەوە کـردووە کـە لـە گـرێ بەسـتەکانیاندا لەگـەڵ بەرپرسـانی دەولـەتانی ئـەفریقادا، لەبەرامبـەردا ئـەو کۆمپانیایانە کرێی تەواو لەو دامەزراوانە بەدەست بهینن، لەپیناو ڕزگاربونیان لە پاشماوە ژەهراوییەکاندا.

هاوینی سالی ڕابردوو ڕۆژنامەی (وست ئـەمریکا) بلاوی کردوە کە وڵاتانی وەکو گینیابیساو گینیا ئیستوائی و کۆنگۆ و بەنین بەلینیان بەیەکتر داوە بۆ وەرگرتنی ساڵانە نزیکـەی ١٠ ملیـۆن تـەن لـە پاشمـاوە تایبەتـەکان، بـەڵام تـا ئیسـتا قـــەبارەی ئـــەو پاشمـــاوە وەرگیراوانـــە لەلایـــەن ئـــەو دەولەتانەوە نەزانراوە.

کیشەی هەژاری و قەرزە کەلەکەبووەکان وایکردووە کە ئەو سـەودانامە گومانلیکراوانـە زیـاتر بـن، ئەمـەش بەراشـکاوی مەودای زولم و زۆری وڵاتانی دەولەمەند لەسەر وڵاتانی هەژار دەردەخات، ئەو کۆمپانیا ناوبراوانە نزیکەی ١٠٠٠دۆڵار بۆ هەرتـەنیك لـە پاشماوەکـان دەدەن لەبەرامبـەر ئـەنجامدانی کارەکانیـاندا، بـەگویرەی گـرێ بـەندە گومانلیکراوەکـان دوو کۆمپانیـای بـەریتانی و کۆمپانیایـەکی سویسـرای تەنـها بـری ٤٠ دۆڵار بۆ هەر تەنیك دەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو برە پارە کەمـــە داهـــاتی نەتـــەوەیی ئـــەو وڵاتـــە هەژارانـــە دوو بەرامبەر دەکات.

وڵاتی گینیا بیسـاو پابـەند بوونـی خـۆی لەبـەردەم ئـەو کۆمپانیایانەدا دەربری کە بۆماوەی (٥) ساڵ (١٥) ملیۆن تەن پاشمـاوەی تایبـەت وەربگریـت، چـەند دەولـەتیکی ئـەفریقی هەژاری دیکەش لەو برە پارەیە کەمتر ڕازی دەبن، کۆمپانیای سیسکوکە بارەگاکەی لە گەروی تاریقە تەنها بری ٢,٥ دۆلار دەداتە حکومـەتی بـەنین بـۆ هـەر تـەنیك لەگـەڵ نیـو دۆلاریـش وەك بەخشـیش بـەپێی نـاوەرۆکی گرێ بەندەکـە، حکومـەتی فەرەنسـاش خـەڵاتی حکومـەتی بـەنینی کـرد بـۆ ئـەو سـەودانامەیە، بـەوەی کـە بـۆ مـاوەی (٣٠) سـالی داهـاتوو کۆمەکی ئابووری بۆ ئەو وڵاتە دابین کردووە.

یـەکیك لـە دامـەزراوە بەریتانیـەکان پیشـەکی بـری ١,٦ ملیۆن دۆلاری بە حکومەتی گینیا ئیستیوائی دا بە مەبەستی ئەوەی کە تا ماوەی (١٠) سالی دیکە بری (٥) ملیۆن تـەن لـە پاشمـاوە ژەهراویـەکان لـە دوورگـەی ئـەنوبن ڕۆبکـات، بـەگویرەی ڕۆژنامـەی (Africian business) خـاکی دوورگـەی نـاوبراو لـەرووی جیۆلۆجیـەوە شـیاو نیـە بـۆ ئەمبارکردنی ئەو پاشماوە ژەهراویانە، لەبەرئەوەی لەبەردی کون کون پیك هاتوون، لایەنەکانی گرنگـی دەران بـە ژینگـە مەترسییەکی زۆریان لینیشتووە

کە ئەو مادە ژەهراویانە دزە بکەنە ئۆقیانوسی ئارامەوەو کارەســاتی دڵ تــەزینی وای لیبکەویتــەوە کــە بــە خەیالدا نەهاتبیت.

کۆمپانیا خۆرئاواییەکان کە گرێ بەندیان لەگەڵ وڵاتانی ئەفریقادا بەسـتووە، شـەرعیەتی سـاختەیان بـە کارەکانیـان داوە، ئەویش لەریگەی چەند گرێ بەندیکی گومانلیکراوەوە و زۆرجـار کۆمپانیـای دیکـەش پـەنا دەبەنـە بـەر شـیوازی نایاسایی بە مەبەستی ڕزگار بوون لەو پاشماوە تایبەتانە. تا ئیسـتاش کـەتنی کەشـتی پترسـبیرگ لـە گـوێی خـەلکیدا دەزرنگیتەوە کە کەشتییەکی ئەلمانی بوو یەکیك لە کۆمپانیا نەمساییەکان لـە هـاوینی ڕابـردوودا بـەکرییان گرتبـوو کـە نزیکەی ١٣٠٠ تەن پاشماوەی بینایی داروخاوی هەلگرتبوو

کە ئەو بینایانەش ئاسایی نەبوون، ئەگینا ئەو کیشەیە سەری هەل نەدەدا لە راستیدا کۆمپانیا نەمسایییەکە شاردبوویەوە کە پاشماوەو پاشەرۆی دامەزراوە پیشەسازییە کیمیاییەکانی هەلگرتبوو، رۆژی (١٨) ی مایۆی رابردوو کەشتییەکە ئاوی روباری دانوبی لە نەمساوە بەرەو تورکیا دەبری کە بریار بوو لەوێ خۆی لەو پاشماوانە رۆبکات، بەلام کاتیك دەسەلاتدارانی تورك لەبەندەری تورکیدا بۆیان دەرکەوت ئەو بارە بە تیشك ئالودەیە، بەبری ١٤٠ بیکاریك بۆ هەر کیلۆگرامیك، بۆیە ریگەیان لە رۆکردنی ئەو بارە گرت و فەرمانیان بەکەشتیەکە دا سنوری ئاوی ئیقلیمی تورکیا بەجێ بهیلیت و لە هەمان کاتیشدا نەیان هیشت جاریکی دیکە بگەریتەوە بۆ دانوب.

هەروەها کەتنیکی دیکەی نزیکیش، بریتییە لەوەی کۆمپانیایەکی ئیتالی پشماوە تایبەتەکانی بۆ خاکی لوبنان گواستەوە بەر لە چەند مانگیگ، بەلام کاتیك دەسەلاتدارانی لوبنان بەو مەسەلەیەیان زانی کە ئەو بارە گومانلیکراوە، داوایان لەو کۆمپانیایە کرد بگەریتەوە، دوای وتوویژ کۆمپانیاکە ملیدا بۆ داواکەی دەسەلاتدارانی لوبنان، ئەوە بو کەشتی (جامبۆنز ست)یان نارد کە بارەکەی هەلگرت و لوبنانی بەجێ هیشت، دەسەلاتدارانی لوبنان هەرەشەی ئەوەیان لە کەشتییەکە کرد بارەکەی بەشیوەی نایاسایی رۆنەکات، ترس و نیگەرانی بەرپرسانی لوبنان هاتەدی چونکە زۆری نەبرد کە رۆژنامەکان هەوالی بەشداربوونی (٦) وەزارەتی میسریان بلاوکردەوەو ریگەیان بەکەشتی ناوبراونەدا کە بارە ژەهراوییەکەی لەبەردەم کەناری میسردا رۆبکات، ئەمە دوای ئەوەی کەشتی ناوبراو چەند هەولیکی دیکەی لەو شیوەیەی دابوو لە ولاتانی دەریای ناوەراست شکستی خواردبوو.

ئەوە تەنها بەشیکە لەو راپۆرتانەی کە رۆژنامەکان بلاویان کردۆتەوە، ئەمەش وا دەریدەخات کیشەکە گەشتۆتە رادەیەك و رەهەندیکی ترسناك و یەکەم قوربانیانیشی ولاتانی جیهانی سێیەمە کە هەژاری تیایدا زۆرە بە تیرامانی ئیجگار ووردی ئەو راستیە، هەست بەمەترسی و خەتەری دەکریت بۆسەر گۆی زەوی بەتەواوی، کاتیك ژەهرەکان دزەی تیشکدانەوەیان دەگاتە ئاوەکان و هەواو خاك، رەنگە پیس بوونەکە بگاتە چەقی مالەکانیش ئەویش لەریگەی خواردن و خواردنەوەو مادە سەرەتاییەکانەوە.

Internet

## نەرمونیانی و زیرەکی جوانی راستەقینەی ئافرەتن

تویژینەوەیەك لەسەر چۆنیەتی هەلبژاردنی هاوبەشی ژیان روونیکردەوە کە پیاوان ئەو ئافرەتانە پەسەند دەکەن کە بەسیفەتی باشی و زیندەگی ناسراون هەرچەندە جوانیشیان کەم بیت.

واشنتۆن- ئەو بیرۆکە بلاوەی لەهەلبژاردنی هاوبەشی ژیاندا پشتی پیدەبەستریت لای پیاوان بەپلەی یەکەم جوانی ئافرەتە، لەکاتیکدا ئافرەتان زیاتر ئەو پیاوانە پەسەند دەکەن کە دەستکەوتیکی مادی بەرزیان هەیە. بەلام لەراستیدا، وەك لەو تویژینەوە نوییەی کە لەگۆڤاری (کەسیتی و دەرونزانی کۆمەلایەتی)دا بلاوکراوەتەوە دەرکەوتووە کە بەشیوەیەکی سەرەکی پشت بەبری سەرنج راکیشانی هەردوو لایەنەکە بۆ یەکتر دەبەستیت جگە لەچەند هۆکاریکی دیکەی گرنگ کە ئەوانیش باشیتی و نەرمونیانی و زیرەکین.

تویژەرەکان لەزانکۆی ویلایەتی ئەریزۆنای ئەمریکی لیکۆلینەوەیان لەسەر دوو کۆمەل لەپیاوان و ژنان لەخویندکارانی زانکۆ کرد بۆیان دەرکەوت، کە ژنان بەپلەی یەکەم جەخت لەسەر باشیتی و نەرمونیانی و زیرەکی دەکەنەوە، پاشان لەسەر ئاستی کۆمەلایەتی و دەستکەوتی سالانە لەکاتی هەلبژاردنی هاوبەشی ژیانیاندا. لەهەمان کاتدا پیاوان لەشولاریکی سەرنج راکیش و زیرەکی لەکرداری هەلبژاردندا بەهۆکاری گرنگ دادەنین، جگە لەچەند سیفەتیکی دیکە وەك کارامەیی زیرەکی هۆش و داهینان ئارەزووە تایبەتییەکان.

تویژەرەوەکان لەتویژینەوەیەکی دیکەدا داوایان لە٥٨خویندکار کرد ئەو سیفەتانە دیاری بکەن کە پیویستە هەبن لەکاتی هەلبژاردنی هاوبەشی ژیانیان بە بەکارهینانی کۆمپیوتەر، تیبینیان کرد کە کچان بایەخ بەئاست و باری کۆمەلایەتی و باشیتی دەدەن بەپلەی یەکەم، لەوکاتەی کە باشیتی و سەرنج راکیشانی یەکتر لەلیستی هەرزەکاراندا جگیەی پلەیەکی باشی هەیە.

سەرنج راکیشانی یەکترو باری کۆمەلایەتی و نەرمونیانی بەشیوەیەکی گشتی بەهۆکاری گرنگ دادەنرین لەرازی بوون یان رەت کردنەوەی هاوبەشی ژیانی چاوەروانکراو لەلای کور و لاو و کچە گەنجەکاندا پیاوان زیندەگی ئافرەت و روخۆشی بەگرنگترین هۆکاری سەرنج راکیشان دادەنین نەك بەتەنها جوانیەکەی.

نیرگز عبدول Internet

# هەستداریّتی کەرەستەکانی جوانکاری

## (Cosmetic Dermatitis)

دڵنیا عبداللە
پسپۆڕی فیزیک

هەستداریّتی کەرەستەکانی جوانکاری بەزۆری لەنێوان گەورەکاندا بڵاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا منداڵە بچووکەکان بەتایبەتی کچان هەوڵ دەدەن بە بەکارهێنانی کەرەستەکانی جوانکاری لاسایی دایکیان بکەنەوە، زۆرجار دایکەکە سەیردەکات کچە بچووکەکەی دەرگای ژووری نوستنەکەی داخستوەو شێوەی جۆراوجۆری ئارایشتو ماکیاجی داوە لەدەموچاوی، بۆئەوەی وا هەست بکات کە گەورە بوەو پێگەیشتووە.

لەم بەشەدا کورتە باسێکی ئەو جۆرە هەستداریە دەکەین کە بیرۆکەی هەوکردنی پێست دەدەن بەدەستەوە، کە بەهۆی هەستداریّتی کەرەستەکانی جوانکاریو هۆکارەکانیەوە پەیدا دەبن.

ژمارەیەکی جیاوازو جۆراوجۆر لەم کەرەستانە هەن کە دەبنە هۆی هەوکردنی پێست لەجۆری (هەستداریّتی بۆن) سەرەتایی یان پێشکەوتوو، گرنگترین ئەو ئاوێتانە ئەمانەن:

**بۆن:**

بۆن بڵاوترین هەست پێکەرەکانە، بەدوایدا هۆکارەکانی دژە میکرۆبەکان دێن.

بۆن یان فۆرماڵدیهاید کە لەهەر کەرەستەیەکی جوانکاری‌دا هەیە، بەلسەم هۆکارە لەناوبەرەکانە، هەروەها بەهاراتیش هەست پێکەرە بڵاوەکانە.

هەموو بۆنێك یان کۆڵۆنیایەکی مام ناوەند بڕێکی جیاواز لەو ئاوێتانەی تێدایە. بۆنە بازرگانیەکان تێکەڵەیەکن لەڕۆنە هەڵچوەکانو ئاوێتە دروست کراوەکان، تێکەڵەی مادە هەڵچوەکان جۆری بۆنی ئاوێتە دیاری دەکەنو بۆئەوەی درەنگ ببێتە هەڵم چەسپێنەرەکانی تێکەڵ دەکرێن. چەسپێنەرە بڵاوەکانیش (بەلسەم، بەنزیل بەنزوات، بەنزیل سالیلیك ئەسید)ە. و هەستداریّتی بەلسەم بەناوبانگە، یەکێك لەجۆرە باوەکانی بەلسەم بیر و بریتییە لەمەسیل سینامیت کە

پاش جیابوونەوە لە ژنەکەی ئێمی ڕۆبنزی هێناو، هەرچەندە کە باوەڕی بەسەربەخۆیی ژنان هەبوو، ناوەکەی گۆڕی بۆ (جین) جین ماڵێکی هێمن و ڕێکوپێکی پێ بەخشی و کاروباری بۆ ڕێکخست و ژیانێکی ئینگلیزییانەی هێمن و ئاسوودەی بۆ دابینکرد. دوو کوڕی جوان و خۆشەویستیشی پێ بەخشی. هەروەها لەبەرئەوەی کە دەیزانی چاپ بکات. بوو بەهاوبەشێکی نموونەیی لە ژیانی وێلزدا چونکە سەرەڕای دڵسۆزی و چاوپۆشیکردن لە سەرچڵییەکانی، بابەتێکی چاپکراوی بێ هەڵەشی بۆ ئامادە دەکرد.

وێلز بۆ ماوەیەکی زۆر چیرۆکی کورتی دەنووسی، بەڵام، لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەوە بەشێوەیەکی بەردەوامتر دەینووسی و هەندێك وتاری زانستی و پێداچوونەوەی هەندێك شانۆگەری بڵاوکردەوە. هەروەها دەستیکرد بەداڕشتنەوەو تەواوکردنی چیرۆکێك بەناونیشانی The Chronic Argonants کە زووتر، کاتێك کە خوێندکار بوو دەستی بەنووسینەوەی کردبوو. ئەم چیرۆکە پاشان بوو بە ڕۆمانێك بەناوی (ئامێری کات) و لەساڵی ١٨٩٥دا بڵاوکردەوەو سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەستهێنا.

زۆر نووسەری دیکە وایان لە کەسایەتی چیرۆکەکانیان کردوو، کە گەشت بەناو کاتدا بکەن بۆ ئەوەی سەدەها ساڵ بەرەو ڕابردوو بگەڕێنەوە، وەکو کەسایەتی (ریپ ڤان وینکڵ Rip Van Winkle) یان بەرەو داهاتوو گەشت بکەن، بەڵام کەسایەتی گەشتکەری کات (کە لە ڕۆمانەکەدا هەر ئەو ناوەی هەیە) لەژێر کۆنترۆڵی ئامێرێکدا هەتا سەد هەزار ساڵ بەرەو داهاتوو دەچێت و لە گەشتەکەیدا بۆی دەردەکەوێت کە لە ئەنجامی دابەشبوونی چینایەتیدا، کە لە سەردەمی ڤیکتۆریدا هەبوو، دوو جۆرە مرۆڤ پەیدا بوون:

جۆرێکی بێهێز و بێ توانا، کە لە منداڵ دەچوون و ناویان (ئیلۆی Eloi) بوو و جۆرێکی شێواو دڕندە کە لە ژێر زەویدا دەژیان و ناویان (مۆرلوك Morlocks) بوو. ئەم جۆرەیان ناوبەناو لەکونەکانیانەوە دەردەچوون و مرۆڤەکانی جۆری یەکەمیان دەخوارد.

وێلز بڕوای بەگەشەکردن هەبوو، وەکو پرۆسەیەك، بەڵام، وەکو هەکسلیی مامۆستای، لەو باوەڕەدا بوو کە مەرج نییە پرۆسەیەکی پێشکەوتو خوازبێت و بەختەوەری و مرۆڤێکی چاکتر بهێنێتە ئاراوە. وێلز هەمیشە دەیپرسی: گەشەکردن بەرەوچی؟

کەسایەتییە گەشتکەرەکە لە ڕۆمانەکەی وێلزدا هەمیشە لە گەشت و جووڵەدایەو چاوی بڕیوەتە دوورترین گەردوونەکانی کات، کە مرۆڤ لەسەر زەوی نامێنێت و هەندێك زیندەوەری سەرەتایی زۆر بەخاوییەوە لە کەناری دەریایەکی ترسناکدا لەسەر سك دەخشێن. دەریایەك کە هەڕەشە لەناوچوونی خودی ژیان دەکات.

بە پێچەوانەی جول ڤێرن و چیرۆکنووسەکانی دیکەی ئەندێشەی زانستییەوە، وێلز بایەخی بەو شتانە دەدا کە دەشێت لە زانستدا ڕووبدەن و زۆر بایەخی بەوردە کارییەکانی زانستی سەردەم نەدەداو گرنگیی زیاتری بەئاسۆی داهاتووی مرۆڤ دەدا. لە ڕاستیدا زۆربەی شاکارەکانی ئەندێشەی زانستی بایەخ بەکەسایەتیی چیرۆکەکان و ڕادەی ڕۆشنبیرییان دەدەن، نەك بەئامێرو داهێنانەکان.

ڕۆمانی "ئامێری کات" خاڵی وەرچەرخان بوو لە ژیانی وێلزدا، چونکە پاش بڵاوبوونەوەی بیرمەندەکان حەزیان بەهاوڕێیەتی دەکردو داوەتیان دەکرد بۆ ئاهەنگەکانی چینە باڵاکان، ئەمەش هەژانێکی لە دەروونیدا دروستدەکرد، چونکە لە ناخەوە هەمیشە بیری لای ئەو چینە هەژارە بوو کە لێوەی هاتبوو. لەیەکێك لەو ئاهەنگانەدا یەکێك لە ئامادەبووان سەیری قاپەکەی وێلزی کردو بینی کە پڕە لە خواردەمەنی بیانی، لێی پرسی: (وادیارە زۆر زۆر حەزت لە کاڤیارە." وێلز لە وەڵامدا وتی : "بەڵێ، زۆر شەیدای کاڤیارم " بەڵام لە ڕاستیدا درۆی دەکرد. بەڵام، سەرەڕای ئەم وردە ناخۆشییانە، ئەو ساڵانە چاکترین ساڵانی ژیانی وێلز بوون، چونکە ببووە هاوڕێ و هاوبەشی هەندێك لەناودارەکانی ئەدەب، وەکو جۆزف کۆنرادو فۆرد مادۆکس فۆرد ستیڤن کرەین و هینری جەیمز. لەو ساڵانەدا دەستیکرد بەنووسینی ڕۆمانی گرنگ کە هەندێکیان دەبنە شاکاری داهاتووی ئەدەبی ئەندێشەی زانستی و هەریەکەیان بەشێوەیەك مامەڵەی تایبەتی لەگەڵ خۆبایبوونی مرۆڤ دەکەن. ڕۆمانی (دورگەکەی دکتۆر مۆرۆ) ١٨٩٦، باسی زانایەك دەکات کە لەوڵاتەکەی دوور خراوەتەوەو لە ڕێگەی داهێنانی هەندێك ئاژەڵەوە کە لە مرۆڤ دەچن، ڕۆڵی خوایەك دەگێڕێت. بەڵام لە ئاکامدا ژیانی خۆی دەکاتە قوربانی ئەو کردارەی. ڕۆمانی (پیاوە نەبینراوەکە ١٨٩٧ هۆشیارییەك دەدات لە بارەی لادانی زانست لە ڕەوتی خۆی. لە ڕۆمانی (جەنگی

گەردوونەکان) دا ١٨٩٨، تاوانی داگیرکردنی وڵاتان بەهۆی هێرشە ئیمپریالیستەکانەوە دەهێنێتەوە بیری هاوڵاتییەکانی و ئاگاداریان دەکاتەوە کە ڕۆژێک دێت ئیمپراتووریەتێکی بەهێزتر لە بەریتانیا پەیدا ببێت (بەپێی ڕۆمانەکە، ڕێکەوت نییە کە دانیشتوانی مەریخ بەتەنها هێرش دەکەنە سەر بەریتانیا).

ساڵی ١٩٠٠، پاش بڵاوکردنەوەی نزیکەی ١٢ کتێب، ئەوەندە پارەی پاشەکەوت کرد کە بتوانێت خانوویەکی گونجاو دروستبکات.

ئەو سەردەمەی ژیانی، لە هەردوو لایەنی کات و شوێنەوە، نموونەیی بوو چونکە تەندروستی باش بوو و لە لوتکەی سەرکەوتندا بوو. سەرەتای سەدەیەکی نوێ بوو و خەڵکەکە زۆر پەرۆشی خوێندنەوە بوون. هێشتا ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دانەهاتبوو و خەڵکەکە کاتیان بەخوێندنەوە بەسەردەبرد، بەتایبەتی ڕۆمانەکانی هـ.ج. ویڵز.

لەو سەردەمەدا، ویڵز بڕیاریدا کەخۆی لەبوارێکی نوێدا، لە دەرەوەی دنیای نووسینی ئەندێشەییدا، تاقیبکاتەوە. لەساڵی ١٩٠١ کتێبێکی بچووکی وروژێنەری نووسی بەناونیشانی "پێشبینییەکانی کاردانەوەی پێشکەوتنی زانستی لەسەر ژیانی مرۆڤ و بیرکردنەوەی". ئەم کتێبەش سەرکەوتنێکی ئێجگار گەورەی بەدەستهێنا. ویڵز سەلماندی کە دەتوانێت لە هەموو بوارەکاندا سەرکەوتووانە بنووسێت. پاش چەند مانگێک داوای لێکرا لە پەیمانگای شاهانەدا وانەیەک بڵێتەوە کە ناونیشانێکی (زایەڵەداری) هەبوو، ئەویش (دۆزینەوەی داهاتوو).

ویڵز دەنگێکی تیژی هەبوو و وشەکانیشی بەشێوەیەکی تایبەتی لەژێر سمێڵەکەیەوە دەردەبڕی و دەتووت وشەکان دەجوێت پێش وتنیان. خەڵکەکەش ئەوەندە بەپەرۆشەوە وشەکانیان وەردەگرت، دەتووت مرواریییان بەسەردا دەبارێنێت.

لەپڕ، ویڵز لەو کوڕە هەژارەوە بوو بەنووسەرێک کە پێشبینی داهاتووی دەکرد. لە ژیاننامەکەیدا دەنووسێت: [یەکێک لەو کەسانەی کە زۆر پەرۆشی کتێبی (پێشبینیەکان) بوو، خۆم بووم، چونکە من یەکەم لایەنگری خۆم بووم].

لەکتێبی "پێشبینیەکان" دا ویڵز پەرەی بە بۆچوونەکانی دەربارەی داهاتووداو هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێت سیستەمێکی جیهانی نوێ دابمەزرێت بۆ ئەوەی بوونی مرۆڤایەتی بەردەوام بێت. سیستەمێك کە دەستەیەکی زانای خاوەن شارەزاییەکی تەکنیکی بەڕێوەیبەرێت و هەوڵبدات جەنگ نەهێڵێت و دەوڵەتی یەك نەتەوەیی لە ناوببات و دەوڵەتێکی گەردوونی دابمەزرێنێت و دیموکراسییەت بچەسپێنێت و نەهێڵێت و خەڵکانی چەواشەکە، کاربکەنە سەر کەسانی نەخوێندەوار و بۆ سوودی خۆیان بیانچەوسێننەوە.

هەروەها لەو حکومەتەدا داهاتەکان بەیەکسانی دابەشبکرێت و دامەزراوە باستانییەکان نەمێنن و حکومەت ببێت بە تەنها ڕاسپێری منداڵان. ئایین لەو حکومەتەدا نامێنێت و سنوور و بەندەکانی هاوسەرێتی کەم دەبنەوە.

ڕژێمی شاهانەش دەبێت بڕوات.

کتێبی (پێشبینییەکان) سەرنجی بیاتریس و سیدنی وێبی سەرۆکی کۆمەڵەی فابییەکانی ڕاکێشا، کە کۆمەڵەیەکی سوشیالیستی دەوڵەمەند بوو. ویڵز خۆیشی چووە ناو کۆمەڵەکەوەو دەستیکرد بەهاندانی لاوان بۆ ئەندامبوون تیایدا. بەڵام پاش ماوەیەك لێیان ڕەنجاو سەرکردەکانیانی بە پارێزگارو بار بەسەر شۆڕشەوە دایە قەڵەم.

برنادشۆ، نووسەری بەناوبانگ، کە ئەندامێکی کۆمەڵەکە بوو، ویڵزی بە "خۆپەرست " و "منداڵی نازدار" دادەنا.

لە ساڵی ١٩٠٨ ویڵز وازیهێنا لە کۆمەڵەی فابیەکان و، لەگەڵ چەند ژنێکدا پەیوەندیی بەست. یەکێك لەو ژنانە (ڕەبیکا وێست) بوو کە نووسەرێکی ئینگلیز بوو ئەو کاتەی کە پەیوەندییەکەی لەگەڵدا بەست، تەمەنی ١٩ ساڵان بوو.

لەو سەردەمانەدا، ویڵز تووشی زۆ دوژمنایەتیی ئەدەبی بوو کە هەندێکیان ساڵانێکی زۆری خایاند. یەکێك لەو دوژمنایەتییانە لەگەڵ (هێنری جەیمز)ی نووسەردا بوو لەسەر ئەو پەیامەی کە دەبێت (ڕۆمان) هەڵیبگرێت. هینری جەیمز باوەڕی بە بنەمای هونەر بۆ هونەر بوو و هیچ جۆرە پەندو ئامۆژگارییەکی لە ئەدەبەکەیدا بەکار نەدەهێناو وەسفی دنیای دەکرد وەکو چۆن کە هەیەو دێتە بەرچاوی، بۆ ئەوەی شتەکان خۆیان ڕاستییەکان دەرببڕن. بەڵام ویڵز بەوە قایل نەبوو. هونەر لای ئەو هۆیەك بوو بۆ خزمەتکردنی ئامانجێك، کە بریتی بوو لە شارستانییەتێکی لە ڕەگەوە گۆڕاو. پاتریك باریندەر دەڵێت:

((ویڵز خراپترین شتی کرد، ئەو وەکو هێنری جەیمز زۆر بایەخی بەشێوازی نووسینی رۆمان نەدەدا، کەچی ئەوەندە رووقایم بوو کە هێنری جەیمز بەوە تاوانبار بکات کە ئەو ئەو بایەخدانەی نییەو رووبەڕوو ئەوەی پێ بڵێت)). پاشان ویڵز، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، بەئاشکرا لە رۆمانی (پیت Boon)دا کە لەساڵی ١٩١٥ دا نووسی هێرشی کردە سەر جەمیزو لەبەراورد کردنێکی بەناوبانگدا، شێوازی نووسینی جەیمزی بە (ئەسپیکی ئاویی زەبەلاح بەراورد کرد کە ئازاریکی زۆری هەیەو دەنکە لۆبیایەکی لی کەوتۆتە خوارەوەو دەیەویت بەهەر نرخیك بیت هەلیبگریتەوە، تەنانەت ئەگەر ئابرووشی بچیت))، بەلام خیرا پەشیمان بووەوەو نامەیەکی پۆزشی بۆ جەیمز نارد، بەلام جەیمز نامەکەی وەرنەگرت و ئیتر بەتەواوی لەیەکتری دابران. جەیمز سالی دوای ئەوە مرد. ویلز پایەی خۆی بۆ چەند سالیکی دیکە راگرت، بەلام نیوەندە ئەدەبییەکان لایەنگری ئەو نەبوون. ئاشکرا بوو کە شیوازی ویلز لە نووسیندا کۆن ببوو و ڤەرجینیا وولف لە بیستەکاندا باسی ئەوەی کرد.

لە سالانی دوای کتیبی (پیشبینیەکان) ویلز ژمارەیەکی رۆمانی سەرکەوتووی نووسی کە هەندیکیان ژیاننامەی خۆی بوونو زۆربەیان گالتەیان بە ژیانی چینایەتیی کۆمەلگای ئینگلیزیو باسی ژیانی دژواری مرۆڤە دەرکەنارکراوەکان دەکرد لەو کۆمەلگایەدا. لەو سەردەمەدا، بەشیوەیەکی راستەوخۆ و ناراستەوخۆ داکۆکیی لە سوشیالیزمی جیهانی دەکرد. ئەم هەلویستەی لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمدا ئاشکرا تر بوو. لەو سالی ١٩١٤ کتیبیکی بلاوکردەوە بەناونیشانی (ئەو جەنگەی کۆتایی بە جەنگ دەهینیت) بەهۆیئەم کتیبەوە چووە گۆرەپانی پەیوەندیی نیو دەولەتیو کەوتە هەولدان بۆ دامەزراندنی (ئەنجومەنی دەولەتان) بەلاك کاتیك کگە دامەزرا، هەستی بەنائومیدی کرد.

بۆ چەند سالیکیش بایەخی بە پەروەردەکردنی مرۆڤ دەدا. گەیشتبووە ئەو باوەرەی کە ((میژووی مرۆڤایەتی بۆتە گۆرەپانی پیشبرکییەك لە نیوان پەروەردەو کارەساتدا)).

هەر لەو سەردەمەدا، ویلز تیمیکی کارکردنی لەخۆیو جۆرجی کوریو جولیان هەکسلی پیکهینا بۆ نووسینی کتیبیکی پەروەردەیی دیکە بەناونیشانی (زانستی ژیان) کە لە سالی ١٩٣١ دا بلاوکرایەوە. لەو سەردەمەدا رۆمانو وتاری پیشبینی دەنووسیو لە ئیستگەی BBCیەوە گوتاری بۆ خەلك بلاو دەکردەوە، هەروەها ناوبەناویش لەگەل پیشەسازی سینەمادا لە هۆلیود مامەلەی دەکرد.

لە سالانی دوایی تەمەنیدا بوو بە مرۆڤیکی سەیر کە، بێ ئەوەی ئامانجیکی تایبەتی یان پلانیکی هەبیت، لەبارەی حکومەتی جیهانیو مافی مرۆڤ دەینووسی. هەر لە سالانی چلەکانی سەدەی بیستەمەوە دەردەکەویت کە ویلز لەریگەی ئارەزووی دانانی حکومەت لە سەرووی خەلکەوە، لایەنی هەلەی هەلبژاردووە لە میژوودا. ئەو یوتۆپیا زانستییەی ویلز، کە دەستەیەکی زۆر بەهیز بەریوەی دەبەن، لەناوەرۆکدا، زۆر لەو زۆردارییە دەچوو کە لە ئەلمانیای نازیو یەکیتی سۆڤیەت پەیرەوی دەکرا. لە سالانی سییەکاندا، ئەلدەس هەکسلی رۆمانیکی نووسی بەناوی (جیهانیکی نوێو ئازا)وە، کە گالتەیەکی زۆری بە بۆچوونەکانی دەکرد. لە سالی ١٩٤١، جۆرج ئۆرویل کە لەسەر خۆشەویستی ویلز پەروەردە ببوو، لە وتاریکدا نووسی: ئەوەی کە ویلز بەدریژایی تەمەنی پشتگیریی لیدەکرد، فەرمانرەوایی نازییەکان بوو.

لەوەش خراپتر پشتگیریکردنی ناو بەناوی بوو لەبیرۆکەی چاکردنیرەگەز (یوجینیا). لە کتیبی (پیشبینییەکان) دا باس لە ئەگەری لەناوبردنی هەموو جۆرە نەخۆشیو میشك سستی دەکرد لە مرۆڤدا، لەلایەن دەستەبژیریکی زاناوە، بەلام لە سالانی دوایی تەمەنیدا وازی لە بیرۆکەی چاکردنی رەگەز هیناو چالاکانە کەوتە پشتگیریکردنی مافەکانی مرۆڤ.

دەستنووسیکی ویلز

لەو سەردەمەدا، رەشبینو نائومید بوو. لە لەندەن لەژیر هەرەشەی هیرشی موشەکەکانی (V-2) ی ئەلمانیادا دەژیا.

دوا کتیب کە ویلز نووسی، کتیبی (میشك لەوپەری سنووریدا) بوو کە لە سالی ١٩٤٥دا بلاوی کردەوە. ئەم کتیبە بۆچوونی زۆر رەشبینانەی تیدایە کە مرۆڤ بەباشی لیی تیناگات. لە کتیبەکەدا دەنووسیت: ((کۆتایی هەموو جۆرە ژیانیك زۆر نزیکەو ناتوانین لیی دەرباز ببین)).

ویلز توانایەکی زۆر بەهیزی هەبوو لە پیشبینیکردنداو وپیشبینی گەشەکردنی بواری پەیوەندیو گواستنەوە کرد بەرادەیەك کە سنووری نیوان ولاتان لاببات.

هەرچەند ئەو گۆرانکارییانەی کە روویانداوە کتو مت ئەوانە نین کە لە ئەندیشەی ویلزدا هەبوون، بەلام زۆر لییانەوە دوورنین.

# سیستمی (ABO)و ڕووخسارە بابەتی "بۆمبای"

# The (ABO) System and Bombay Phenotype

نوسینی : دڵشاد حسێن دەروێش
تاقیگەی نەخۆشخانەی قەڵادزێ

**(سیستمی گروپەکانی خوێن)**

**(Blood group systmes)**

*ئەو دژەپەیداکەرانەی (Antigens) کە لەسەر ڕووی خڕۆکە سورەکانی کەسێکە، جۆری خوێنی ئەوکەسە دیاری دەکەن، دیاری کردنی جۆری دژەپەیداکەرەکەش بەهۆی دژە تەنەکەیەوە (Antibody) دەبێت، کە دەتوانێت کارلێکی لەگەڵدا بکاتو خڕۆکە سورەکان کەڵەکە بکات.

*جیاوازی بۆهێڵە لۆکەس (Gene Loci)و فرەجۆری ئەو دژەپەیداکەرانەش وای کردووە کە لە ژێرناوی چەند سیستەمێکدا پۆلێن بکرێت، هەریەکێك لەو سیستەمانەش لەژێر کۆنترۆڵی بۆهێڵێك یان چەند بۆهێڵێك دان.

*تاوەکو ئێستا نویکەی پانزە سیستمی گروپی خوێن دۆزراوەتەوە، کە هەندێکیان بۆدیاریکردنی ڕەسەنایەتی باوانی منداڵ و (Parentage)و هەندێکی دیشیان لەڕووی کلینیکیەوە گرنگیان پێ دراوە. ئەوەی زیاتر ناسراوبێتو لەڕووی کلینیکی‌یەوە گرنگی زیاتری پێ درابێت، بریتین لە هەردوو سیستمی (ABO)و (Rh)، کە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینین لەکرداری گواستنەوەی خوێنو هەوڵدان بۆ نەهێشتنی هەندێك باری شیبوونەوەی خوێن لە کۆرپەلەدا (Erythroblastosis Fetalis).

*ئەو بۆ هێڵانەی کە بەرپرسیارن لە دەرکەوتنی هەر سیستەمێك کەوتونەتە سەر کرۆسۆمێکی دیاری کراو یان دەشێت سیستەمێك لەژێر کۆنترۆڵی دوو بۆهێڵ دابێتو ئەم دوو بۆهێڵەش لەسەر دوو کرۆمۆسۆمی جیاوازبن.

***دۆزینەوەی سیستمی (ABO)***

*دۆزینەوەی ئەم سیستەمە لەسەر دەستی زانا "کارل لاندشتاینەر" بوو لەساڵی (١٩٠٠-١٩٠١) ئەوەی هانی ئەم زانایەی داوە بۆ دۆزینەوەی (ABO)، ئەو تاقیکردنەوانەی بووە کەلەسەر تێکەڵاوکردنی خوێنی زیندەوەرە جۆر جیاوازەکانی دەکرد.

*کاتێك لاندشتاینەر خوێنی خۆیو پێنج هاوڕێکەی، بەهەموو ڕێ تێچوونەکانەوە تێکەڵاوکرد (بەجیاکردنەوەی زەرداوی خوێنو

خڕۆکە سورەکان لەیەکتری)، بۆی دەرکەوت کە زەرداوی دکتۆر (پلێسچینگ) دەتوانێت خڕۆکە سورەکانی دکتۆر (ستۆرلی) کەڵەکە بکات، بەڵام خڕۆکە سورەکانی خۆی کەڵەکە نەدەکرد. لەمەوە بۆی دەکەوت کە دەبێت دژەتەنێك لەناو ئەو زەرداوەدا هەبێت بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر خڕۆکەکان.

| سیستەمەکان | شوێن لە جینۆمدا (ژمارەی کرۆمۆسۆم) |
|---|---|
| ABO | ٩ |
| Rh | ١ |
| MNS | ٤ |
| Duffy | ١ |
| Lutheran | ١٩ |
| Lewis | ١٩ |
| Kidd | ١٨ |
| LW | ١٩ |
| MHC | ٦ |
| Ss | ٤ |
| Xg | کرۆمۆسۆمی X |

ئەوەبوو سی ساڵ پاش ئەم دۆزینەوەیە خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا، کە یەکەم کەس بوو لەبواری بۆماوەزانیدا (نۆبڵی) پێ بدرێت.

*لەمەوە دەدەکەوێت کە دۆزینەوەی (ABO) سەرقافڵەی دۆزینەوەی سیستەمەکانی دی بووە، و هەر ئەم سیستەمەشە کە دەتوانرێت بەتاقیکردنەوە سادەکەی لاندشتاینەر پەی پێببرێت، چونکە هەر دژە تەنەکانی ئەم سیستەمەیە کە سروشتیانە لەناو زەرداوی خوێن دا هەن.

**بۆ ماوە لۆکەسی (ABO) لە جینۆمدا**

*سیستەمی (ABO) لەژێر کۆنترۆڵی ئەو بۆهێڵەدایە کە کەوتۆتە سەر کرۆمۆسۆمی ژمارە (٩)- باڵی Q-پارچەی(٤) لە گورزەی ژمارە (٣) (9Q34.1). ئەم بۆ هێڵەش بۆ هێڵێکی فرە ئەلیلی سیانییە (Trimultiple Allelism)، واتە سێ ئەلیلی ئەلتەرناتیڤی هەیە بۆیەك بۆهێڵ، بەڵام لەیەك کاتدا تەنها دوو ئەلیل جێگەی دەبێتەوە لەسەر بۆهێڵە لۆکەسی (ABO)، ئەم قسەیەش ڕاستە بۆهەر بۆهێڵێکی دی لە جینۆمدا، و لەبەربوونی باری فرە ئەلیلی (O,B,A) لە ABOدا، ڕووخسارەبابەت و بۆماوە بابەت لە ژمارەدا یەکسان نین، کە بەشێوەی ئاسایی شەش بۆماوەبابەت هەیە کەدەبنە هۆی دەرکەوتنی چوار ڕووخسارەبابەت، لەمەوە دەتوانین بگەینە ڕێسایەك کە ژمارەی بۆماوەبابەتەکانی سیفەتێك یەکسانە بە فاکتۆریەتی ژمارەی ئەلیلەکانی ئەو سیفەتە.

*بۆماوەزانە کلاسیکییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە تەنهایەك بۆهێڵ کاردەکاتە سەر دەرکەوتنی (ABO)، بەڵام پاش زانینی کیمیکە پێکهاتنی دژەپەیداکەرەکان دەرکەوت کە ئەم سیستەمە بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بەجینێکی دیش دەبەستێت کەبۆهێڵە لۆکەسی لەسەر کرۆمۆسۆمی ژمارە (٩) نییە، بەڵکو کەوتۆتە سەر کرۆمۆسۆمی ژمارە (١٩) و ناونراوە بە بۆهێڵی (H).

**فینۆتایپی دەردان لە (ABO) دا**
**Secretion of ABO antigens**

*سەرەتا وازانرابوو کە تەنها شوێنی دژپەیداکەرەکانی (ABO) سەر ڕووی خڕۆکە سورەکانە، بەڵام دەرکەوت کە لە ٨٠٪ی خەڵك دەتوانن ئەم دژپەیداکەرانە بەشێوەی تواوە دەربدەنە ناو شلەکانی لەشەوە، وەکو: (لیك، فرمێسك، تۆواو، شیری دایك، ئاوگی گەدە، ئاوگی زراو، شلە دەردراوەکانی زێ......هتد)

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە زۆربەی شانەکانی لەشدا بەدی دەکرێن بەتایبەتی خانەکانی بەشی سەرەوەی کۆ ئەندامی هەرس و گلاندەکانی ئەم کۆئەندامە.

*ئەم ڕووخسارە بابەتە لەژێر کۆنترۆڵی ئەلیلێکی زاڵدایەو هێما کراوە بە (Se)، واتە لە هەردووباری Se/Se , Se/seدا کەسەکە توانای دەردانی هەیە. بەڵام لەباری بەزیودا se/se کەسە ناتوانێت دژ پەیداکەرەکان دەربداتە ناو شلەکانی لەشەوە.

-بۆماوە لۆکەسی ئەم بۆهێڵە کەوتۆتە سەر کرۆمۆسۆمی ژمارە(١٩)، بەڵام بەرهەمە پرۆتینی جینی دەردەرو (Se/-) میکانیزمی کارکردنی بەتەواوەتی نەزانراوە، بەڵام گریمانەیەك هەیە کە دەڵێت: ئەوکەسانەی کەتوانای دەردانیان نییە (se/se)، لە ئەنجامی نەبوونی ئەو ئەنزایمەیە کە ڕۆڵی هەیە لە گۆڕانی پێشینە ماددەی -Hو پێدانی توانای توانەوەی دژ پەیداکەرەکان لە ئاودا.

*لەووڵاتە پێکشەوتووەکان ئەم سیفەتە لەبورای تاوانزانیدا (Forensic science) بەکاردێت، بۆ دەست نیشانکردنی تاوانباران یان بێبەری کردنیان لەتاوانەکە لەڕووی یاساییەوە چونکە دەرکەوتووە کە تەنها ئەو دژ پەیداکەرانە دەردەدرێن (ABO) کە لەسەر ڕووی خڕۆکە سورەکانن.

| ڕووخسارەبابەت | بۆماوە بابەت |
|---|---|
| دەردانی دژپەیداکەرەکانی ABO | Se/- |
| دەرنەدان (تەنها لەسەر خڕۆکە سورەکان) | (se/se) |

**پەیوەندی نیوان گروپەکانی خوین و هەندیك نەخۆشی:**

*لەم چەند سالەی دوایدا هەندیك لە زاناکانی بواری نەخۆشیزانی ئاماژە بەپەیوەندی نیوان هەندیك نەخۆشی و گروپیکی دیاری کراو دەکەن لە خوین، بۆ نمونە، زۆربەی ئەوکەسانەی تووشی نەخۆشی داخورانی دوانزەگرێ (Duodenal ulcer) دەبن، گروپی خوینەکەیان لە جۆری (O)یە، و دەرکەوتووە کە زۆربەی ئەو کەسانەی تووشی شیرپەنجەی گەدە دەبن، گروپی خوینەکەیان لە جۆری (A)یە وەك لەوەی جۆری (O) یان (B)بن.

*زاناکان گومانیان هەیە لەوەی کە ئەم پەیوەندییە پەیوەست بیت بە خەسلەتی دەردانی دژپەیداکەرەکان بە ریژەیەکی زۆر لەو ناوچانەی کە تووشی ئەم نەخۆشیانە دەبن.

**پیکهاتەی کیمیایی دژ پەیداکەرەکانی ABO:**

*دژپەیداکەرەکانی ABO، چ لەسەر خرۆکە سورەکان یان لەناو شلەکانی لەش یان لەسەر هەرخانەیەکی دیبن، بریتین لە زنجیرەیەکی کاربۆهیدرەیتی کورت کە لەشەش شەکر پیکهاتووە ئەمانەش نووساون بەگەردیکی هەلگرەوە (carrier) لە ناو پەردەی پلازمای خرۆکە سورەکاندا، ئەم گەردە هەلگرەش دەشیت پرۆتین یان چەوری بیت و بەهەموو گەردەکەش دەوتریت شەکرە پرۆتین (Glycoprotein) یان شەکرە چەوری (Glycolpids)، بەلام لەناو شلەکانی لەشدا تەنها لەشیوەی شەکرە پرۆتین دان.

*لەسەر خرۆکە سورەکان، بەشە هەلگرەکە نقووم بووە لە پەردەی پلازماداو زنجیرە کاربۆهیدەیتەکەش دەرپەریوەتە دەرەوە بۆ پیکهینانی بەشە سەرقالەکەی گەردەکە (Businessend) ئەمەش توانای دژ پەیداکەریتی (Antiginicity) دەداتە B,A بۆ ئەوەی بەشیوەی جیاواز لەیەکتری کارلیك بکەن، ئەم تایبەتمەند بوونەش دەگەریتەوە بۆ جۆری ئەو شەکرەی کە دەکەویتە کۆتایی زنجیرە کاربۆهیدریتەکە.

*ئەگەر کلیلە- شیکاریك دابنیین بۆ ئەو شەکرانەی کە دژپەیداکەرەکانی (ABO) یان پیکهیناوەو رەنووسیان بکەین بەژمارە:

1-Galactose
2-Glucose
3-Fucose
4-N-acetyl galactose amine
5- N-acetyl glucose amine

ئەوا دژ پەیداکەری A ریزبوونی شەکرەکانی بەژمارە بریتییە لە: 4-21513، هەروەها دژ پەیداکەری B کۆدی ریزبوونی شەکرەکانی بریتییە لە: 1-21513 (لە چەپەوە بۆ راست). لەمەوە دەردەکەویت کە دواشەکر لە دژ پەیداکەری A بریتییە لە : ن- ئەسیتایل گالاکتاۆز ئەماین، کە بەکۆمەلەی ئەماینۆ ئەسیتایل ($-NH\text{-}CO\text{-}CH_3$) کۆتایی هاتووە، بەلام دواشەکر لە دژەپەیداکەری B بریتییە لە : گالاکتۆز، کە کۆتاییەکەی کۆمەلەی هایدرۆکسیلە ($-OH$).

*ئە جیاوازییە کیمیکیە بچووکەی نیوان B,A دەتوانیت تایبەتمەندی بەرگری دژ پەیداکەرەکان بگۆریت و ئەو دەرەئەنجامە ترسناکە دروست بکات کە لەوانەیە لە بەهەلە گواستنەوەی خویندا روو بدات.

*لاندشتاینەر یەکەم کەس بووە کە ووردکاری کارلیکی نیوان دژەتەن- دژەپەیداکەری روون کردۆتەوەو پیشانی داوە کە دەبیت گروپی کیمیکی بچووك نووسابیت بە گەردی گەورەترەوە، ئەمانەش یەکەی بنچینەی دژپەیداکەرن.

*زۆرجار واباس دەکریت کە ئەوانەی گروپی خوینیان (O)یە هیچ دژپەیداکەریك لەسەر خرۆکە سورەکانیان نییە، بەلام لەراستیدا وانییە، بەلکو کەسانی O جۆرە دژەپەیداکەریکیان هەیە کە پیی دەوتریت ماددەی $^{H-}$، ئەمەش لە پینج شەکر پیکهاتووەو کۆدی ریزبوونیشیان بەپیی کلیلەکە بەم شیوەیە:

21513، لەمەوە دەردەکەویت کە هەرسێ جۆر دژپەیداکەرەکە (O,B,A) لەماددەی $^{H-}$دا هاوبەشن (21513)، واتە دژپەیداکەری A جگە لە ماددەی $^{H-}$شەکری شەشەمیشی هەیە کە لە کلیلەکە ژمارە (٤)، و بۆ دژپەیداکەری B ژمارە (١)، بەلام گروپی (O) شەکری شەشەمیان نییە، لیرەدا پرسیاریك سەرهەلدەدات کە ئایا بۆچی ماددەی $^{H-}$ وەك دژ پەیداکەریك نەژمیراوە لەسیستمی پۆلین کردنی گروپەکانی خویندا؟ دەشیت وەلامی پرسیارەکەش ئەوەبیت کە ماددەی $^{H-}$ لەباری ئاسایدا، هیچ دژەتەنیکی نییە لەزەرداودا، بەپیچەوانەی B,A کە بۆ هەردووکیان دژەتنی تایبەتی هەیە (anti-B , anti-A).

**قۆناغەکانی دروست بوونی ABO:**

**Biosynthesis of ABO antigens**

*لە سیستمی ABOدا سێ هەنگاوی هاوبەش هەیە لە زیندەپیکهاتنی هەر سێ دژپەیداکەرەکە:

١-لەسەرەتادا مادەی پیشینە (Precursor) دروست دەبێت کە لە دوو شەکر پێکهاتووە (-1-2-) ئەمیش دەنووسێت بەگەردیك پرۆتین یان چەوری لەناو پەردەی پلازمادا.

٢-دوای هەنگاوی یەکەم، مادەی ناوەندی (Intermediate) دروست دەبێت کە لە چوارشەکر پێکهاتووە (-2151)، واتە بەخستنە سەری دوو شەکری تر(51) بۆسەر مادەی پیشینە (21)، مادەی ناوەندی دروست دەبێت.

٣-هەنگاوی سێیەم بریتییە لە دروست بوونی (مادەی $^{H-}$)، پێکهێنانی ئەم مادەیەش لەژێر کۆنترۆلی ئەلیلی زالی H دایە (H/h , H/H) کە بەر پرسە لە دروستکردنی ئەنزایمی Fucose transferase، کاری ئەم ئەنزایمەش بریتییە لەگواستنەوەی شەکری فیکۆز (٣) بۆ سەر مادەی ناوەندی (-2151)، بەخستنە سەری ئەم شەکرە، مادەی H دروست دەبێت (٢١٥١٣).

*هەندیك کەس جینۆتایپیان یەك رەگی بەزیوە (h/h) بۆ ئەم بۆ هیلەو ناتوانن ئەنزایمەکە دروست بکەن، دەرەنجامی ئەمەش دروست نەبوونی (ماددەی-H)ە، ئەگەر لەم بارەدا کەسەکە بۆماوە پرۆگرامی (A) یان (B) یان (AB) یان (O)بێت هیچ دژپەیداکەریك لەسەر خرۆکە سورەکانی دروست نابێتو ئەوکەسە دەبێتە خاوەن سیفەتیك کەپێی دەوترێت (روخسارە بابەتی بۆمبای) (Bombay phenotype)، بەڵام ئەگەر کەسەکە یەك رەگ یان دوو رەگ بێت بۆ هیلەکە (H/h H/H) ئەوا دەتوانێت ماددەی H- دروست بکات، کە لە دواییدا وەك بنچینە ماددەیەك (Substrate) کاردەکات بۆ ئەنزایمەکانی بۆ هیلەبەرهەمی B,A.

**دروست بوونی گروپی خوینی A**

*ئەگەر بیتو کەسیك بۆماوە پرۆگرامی خوینەکەی A بێت (A/A A/O) و هەلگری ئەلیلی Hبێت، ئەوا لەسەر کرۆمۆسۆمی ژمارە (٩) ئەو بۆهیلەی هەیە کە بەرپرسە لە کۆدکردنی ئەنزایمی N-acetylgalactose amine، ئەم ئەنزایمەش هەلدەستێت بەگواستنەوەی شەکری ژمارە (٤) بۆسەر مادەی H-، بەمەش دژ پەیداکەری A دروست دەبێت (4-21513)و کەسەکە گروپی خوینەکەی Aدەبێت.

*هەر چەندە ئەم گروپە دوو فۆرمی بۆماوەیی جیاوازی هەیە کە بە $A_2$ , $A_1$ ناسراون، کەوا باوەردەکرێت دەرەنجامی جۆریك لە بازدان (Mutation) بێت کەبەسەر بۆهیلی Aدا هاتووە، لەبەرئەوە لەکاتی خوین گواستنەوەدا پێویستە رەچاوی پشکنینی گونجان (cross-match) بکرێت کەلەوانەیە بەخشەرو وەرگر دوو فۆرمی جیاوازبن لە گروپی A.

**دروست بوونی گروپی B**

*ئەگەر بیتو کەسەکە پرۆگرامی بۆماوەیی B بێت (B/O , B/B) و پۆزەتیڤ بێت بۆ بۆهیلی H، ئەوا ئەو بۆهیلەی هەیە کە هەلدەستێت بەکۆدکردنی ئەنزایمی Galactose Transferase کاری ئەم ئەنزایمەش بریتییە لەگواستنەوەی شەکری گالاکتۆز (١) و نووساندنی بە (ماددەی-H)ەوە، بەمەش دژپەیداکەری B دروست دەبێت (1-21513)و ئەوکەسە جۆری خوینەکەی Bدەبێت.

**دروست بوونی گروپی AB**

*ئەگەر کەسەکە بۆماوە پرۆگرامی خوینەکەی AB بوو (A/B) و هەلگری ئەلیلی Hبوو، مانای وایە هەردوو ئەلیلی Aو ئەلیلی Bهەیە، لەبەرئەوە ئەوکەسانە دەتوانن هەردوو ئەنزایمەکە دروست بکەن، کە هەلدەستن بەگواستنەوەی هەردوو شەکری ژمارە (١)و ژمارە (٤) بۆسەر مادەی H- کەدواجار لەسەر خرۆکە سورەکان هەردوو دژپەیداکەری B , A بەدی دەکرێت.

**دروست بوونی گروپی (O)**

*ئەگەر کەسەکە بۆماوە پرۆگرامی (O) بێت (O/O)و هەلگری ئەلیلی Hبێت، واتە هیچ ئەلیلیکی نییە بۆ دروست کردنی هیچ کامیك لە ئەنزایمەکان و ئەگەر ئەنزایمیکیش دروست بکات لە کارکردندا ناتەواوەو ناتوانێت هیچ شەکریك بگوازێتەوە سەر مادەی H-، بەمەش تەنها دژ پەیداکەر لەسەر خرۆکە سورەکان مادەی H- دەبێتو ئەوکەسە جۆری خوینەکەی (O) دەبێت.

*لەمەوە دەردەکەوێت کە کەسانی گروپی (O) پشت نابەستن بە ئەلیلەکانی ABO بەلکو لەژێر کاریگەری ئەلیلی H دان.

-لەمەوە دەتوانین مافی دژ پەیداکەریتی بەمادەی H- بدەین چونکە دەتوانرێت خوینی کەسانی (O) بەدژەتەنی anti-H کەلەکە بکرێت، بەڵام لەباری ئاسایدا ئەم دژەتەنە دەگمەنە (جگە لەکەسانی بۆمبای)، هۆی ئەم دەگمەنیەش دەشێت بۆئەوە بگەرێتەوە کە هەموو تاکیك چ گروپەکەی Aیان B یان AB بێت، بەلایەنی کەمەوە بریك لە دژەپەیداکەری H لەسەر خرۆکە سورەکانی دەمینێتەوەو ناگۆردرێت بۆ دژپەیداکەرە پرۆگرامکراوەکەی، چونکە سیستمی بەرگی لەباری ئاسایدا دژە تەن دژی دژ پەیداکەرەکانی خۆی دروست ناکات.

هۆی جیمانەکەش دەگەرێتەوە بۆ کاری هەردوو ئەنزایمی گوێزەرەوەی B , A کە هەموو مادەی H- ناگۆرن بۆ دژپەیداکەری

A یـان B، هـەر ئەمەشـە وای کـردووە کـە دژەتـەنی anti-H لـە زەرداوی خویندا خویندناو دروست نەبێت.

### دژە تەنەکانی سیستمی ABO
### ABO antibodies

*وەك ریسـایەك، دژەتەنـەکان لـە ئـەنجامی بەرپەرچدانـەوەی سیستمی بەرگری لەش دروست دەبن دژی دژپەیداکەریکی بیگانە، واتە دروست بوونیان بۆ ماوەییانە پرۆگرام نەکراوەو بۆ هیلیکی دیاری کراو نییـە بـەرپرس بیـت لەدروسـت کردنـی دژە تـەنیکی تایبـەت، بـەلکو تەنـها مـادە خاوەکـەیان پرۆگـرام کـراوە ئـەویش پرۆتینی (گاما-گلۆبیولین).

*لـیرەدا پرسـیاریك هەیـە، ئایـا چـۆن دژەتەنـەکانی ABO دروست دەبن؟

پیـش ئـەوەی وەلامـی پرسـیارەکە بزانـین پیویسـتە ئـەوە لەیادنەچیت کە کەسانی A، دژەتەنی anti-B یان هەیەو ئەوانەش کە جۆری خوینەکەیان B، دژەتـەنی anti-A یـان هەیـە، هـەروەها کەسانی O هـەردوو دژە تەنەکەیان هەیە، بەلام کەسـانی ABهیـچ یـەکیك لـەو دوو دژە تەنانـەیان نییـە. و دەرکـەوتووە کـە ئـەم دژەتەنانە بەزۆری لە جۆری (Igm)ن.

زۆر ئاویتـەی کیمیـایی هەیـە لەرووەکـەکاندا کـە پیکهاتـەی کیمیایـان بەدژە پەیداکەرەکانی A و B دەچن، ئەمـە جگـە لـەوەی کەدیواری زۆر لەبەکتریاکانی ناو ریخۆلە زنجـیرەی کـاربۆهیدراتی ئـەوتۆیان لەسـەرە کـە لەپیکهاتـەدا بـە A , B دەچـن، ئیمـەش بێگومان ئەم رووەکانە دەخۆین‌و سیستمی بەرگری دژەتـەنیان بۆ دروست دەکات، بۆ نمونە ئەگەر یەکیك جۆری خوینەکەی Aبیت، دژەتـەنی anti-A دروسـت ناکـات هەرچـەندە سیسـتمی بـەرگی تووشی ئەو ئاویتانە دەبیت کە Aدەچن، بەلام دژەتـەنی anti-B دروست دەکات بۆ ئـەو ئاویتانـەی کـە بـە B دەچـن، چونکـە وەك بیگانەیەك سەیری دەکات.

**دژەتەنی anti-H**

*ئەم دژەتەنە، بەپیچەوانەی هـەردوو دژەتـەنی anti-Aو anti-B ، بەشیوەی ئاسایی لەناو زەرداودا بەدی ناکریت، چونکە هەموو کەسـیك بـەبێ جیـاوازی گروپـەکان، مـادەی H- لەسـەر خرۆکـە سـورەکانی بـەدی دەکریـت (جگـە لەکەسـانی خـاوەن سیفەتی بۆمبای).

*یـەکیك لـە سـەرچاوەکانی ئەم دژەتەنـە ئـاوگی هـەندیك جـۆر رووەکە کە ئاویتەی ئەو تۆیان تیدایە کە دەتوانیت خوینی جۆری (O) کەلەکـە بکـات، بـەو مادانـەش دەوتریـت (خویـن کەلەکـەرە رووەکی‌یەکان) (Phytohaem agglutinins).

*یەکیك لەو ناسەرەوانەش کەتوانراوە دەبهینریت بریتی‌یـە لـە ئاویتەیـەکی کیمیـای کـە لـە تـۆوی رووەکـی Ulex europeans هەیـە، کـە سـەر بـەخیزانی پاقلەمەنی‌یەکانـە. مادە دەرهینراوەکـەی ئەم رووەکە زۆر بەهیز کارلیك لەگەڵ خرۆکە سورەکانی جۆری (O) دا دەکات‌و دەتوانیت کەلەکەیان بکات. زاناکان بۆیان دەرکـەوتووە کە ئەم ئاویتە رووەکی‌یە هەمان چالاکی دژەتەنی anti-H ی هەیە.

*سەرچاوەی ئەم دژەتەنە لەناو زەرداودا تەنها ئەوکەسانەن کە خـاوەن رووخسـارە بابـەتی (بۆمبـای)ن، چونکـە ئەوکەسـانە هیـچ دژپەیداکەریکی سیستمی (ABH) یان نی‌یە.

### رووخسارە بابەتی بۆمبای
### Bombay Phenotype

*دۆزینـەوەی ئـەم فینۆتایپـە دەگمەنـە بـەهۆی رووداویکـی ریگاوبانەوە دەبیـت لەشـاری (بۆمبـای) لـە هندسـتان، کـە تیـایدا دووکەس بەخەستی بریندار دەبن‌و دەگوازرینەوە بۆ نەخۆشخانە، کاتیك پشکنینی جۆری خوینەکەیان بۆ دەکریت، دەردەکەویت کە هـــەردوکیان (O)ن، و لـــە مەوپیشـــیش هیـــچ خوینیکیـــان بۆنـەگوازرابۆوە، بـەلام کـاتیك پشـکنینی گونجانیـان (Cross-matching) لەگەڵ خوین بەخشەکاندا بۆ دەکریت دەردەکویت کە زەرداوی خوینـی ئـەو دووکەسـە خرۆکـەی سـوری بەخشـەرەکان کەلەکە دەکەن (Incompatable)، ئەوەبوو ژمارەی ئەو کەسانەی بۆ ئەم پشکنینە تاقی‌کرانـەوە دەگاتـە ١١٥ کـەس‌و خوینـی هیـچ کـامیك لەوانـەیان بـۆ نـابیت، هەرچـەندە گروپـی خوینەکەشـیان (O)بووە، بۆیە پزیشکەکان ناچـار دەبـن کـە تەنـها پلازمایـان بـۆ بگوازریتـەوە، بـۆ ئـەوەی گرفتـی خویـن بەربوونەکـەیان چارەسـەر بکریت.

*لە ئەنجامی چەند لیکۆلینەوەیـەکدا دەردەکـەویت کـە لـەناو زەرداوی خوینی ئەو دووکەسە، سەرەرای هـەردوو دژەتـەنی anti-Aو anti-B بەریژەیـەکی زۆریـش دژە تـەنی anti-H هەیـە، کـە هۆکاری کەلەکەکردنی خوینی بەخشەرەکان بووە.

| دژەتەن لەناو زەرداودا | دژپەیداکەر لەسەر خرۆکە سورەکان | روو خسارەبابەت |
|---|---|---|
| anti-A و anti-B | مادەی $^{H-}$ نی‌یە | گروپی (O)ی ئاسایی بۆمبای |
| anti-H وanti-B و anti-A | | |

*ئەگەر بیت‌و یـەکیك پۆزەتیـڤ بیت بۆ (بۆمبـای) بەپشـکینی ئاسایی نـاو تاقیگـە دەردەکـەویت کـە گروپـی (O)یـە، بـەلام ئەگـەر دژەتـەنی anti-H مـان هـەبیت دەتوانین دیـاری بکـەین ئـاخۆ ئەمـە فینوتایپی بۆمبایە یان گروپی (O)ی ئاسایی‌یە.

**بۆماوە شیکاری رووخسارەبابەتی بۆمبای**

*ئەم جۆرە فینوتایپە ئەوکەسانەن کە پۆزەتیڤن بۆ دژەتەنی anti-H هەڵگری بۆ هیلی بەزیوی (h/h)ن، ئەم بۆهیلەش کەوتۆتە سەر کرۆمۆسۆمی ژمارە (١٩). ئەوکەسانە ناتوانن ئەنزایمی Fucose transferase دروست بکەن و بەبێ بوونی ئەم ئەنزایمەش شەکری فیوکۆز (ژمارە ٣) ناگوازرێتەوە سەرمادەی ناوەندی (21513)، دەرەنجامی ئەمەش بریتییە لەبلۆك کردنی ریرەوی ئەو زیندە چالاکییانەی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی مادەی H-، وبەبێ ئەم مادەیەش ئەو ئەنزایمانەی کە لەلایەن ئەلیلەکانی (A , B)ەوە کۆد دەکرێن ناتوانن دوایین شەکر بگوازنەوە سەر مادەی ناوەندی، چونکە سایتی ئیش کردنیان تەنها لەسەر شەکری فیوکۆزە، ئەم شەکرەش دوایین شەکرە لە ماددەی H-.

*لێرەدا شتێکی دیمان بۆ روون دەبێتەوە کە دەشێت یەکێك بۆماوە بابەتەکەی (Genotype) -/A یان -/B یان A/B بێت، بەڵام رووخسارەبابەتەکەی (Phenotype) گرووپی (O) بێت، واتە کەسەکە لەراستیدا (O) نییە بەڵام بۆهیلی h/h ناراستەوخۆ بلۆکی دەرکەوتنی دژپەیداکەرەکانی (ABO)ی کردووە، ئەم بارەش لە بۆماوەزانیدا پێی دەوترێت ریگریتی (Epistasis)، و بە بۆهیلەکەش دەوترێت بۆهیلی ریگری بەزیو (Recessive Epistatic Gene).

*یەکێك لە خەسلەتەکانی ئەم بۆهیلانە ئەوەیە کە ریگرن یاخود گۆرانکاری دروست دەکەن لە پرۆسەی کۆدکردنی بۆهیلی دیدا.

*هەرچەندە ئەم بۆهیلە (h/h) لەمانا بۆماوەییەکەیدا بەزیوە بەڵام زاڵە بەسەر کاری ئەنزایمەکانی بۆهیلی A و Bدا. هەروەها ریگریشە لەبەردەم فینۆتایپی دەردان لە ABOدا.

*ئەم بارەش بەجۆرێك لەبەیەکدا چوونی جینەکان دا دەنرێت (Gene Interaction).

*لێرەوە دەتوانین بگەینە راستییەکی دی کە لەسیستمی ABOدا جگە لە باری زاڵبوونی تەواو (Complet Dominance) A/o و B/o هاوزالیتی (codominance) (A/B)، باری ریگریش (Epistasis) هەیە، کە جۆریکە لە بۆماوە نامەندلییەکان.

کەواتە دەشێت کچێك جۆری خوێنەکەی (O) بێت و شو بەکورێك بکات گروپەکەی (B) بێت و منداڵیکیان ببێت جۆری خوێنەکەی A بێت!؟ بێ ئەوەی گومانمان بۆ ئەوە بچێت کە ئەم منداڵە ناشەرعییە Illigitimate چونکە ئەگەر بەشێکارە کلاسیکییە باوەکە لێك بدرێتەوە ئەوا ناشێت هیچ منداڵیکی A لەدایك بێت، چونکە ئەگەرەکانی شیکارە باوەکە بریتییە لە منداڵی B یان O، بەڵام حالەتە شتێکی ئاساییەو بۆماوەشیکاری خۆی هەیە:

*لەم بارەدا دەبێت کورەکە هەڵگری ئەلیلی H بێت، هەروەها جینوتایپی گروپی خوێنەکەی لەباری دوورەگدا بێت (B/O)، و لەبەرئەوەی منداڵیکی A لەدایك بووە، دەبێت کچەکە فینۆتایپی بۆمبای بێت (h/h) و لە هەمان کاتدا هەڵگری ئەلیلی Aبێت کە رەگ نەزانراوە. ئەم منداڵە لە ئەنجامی ئەو سپێرمەوە دروست بووە کە هەڵگری هەردوو ئەلیلی H, O بووە هەستاوە بەپیتاندنی ئەو هێلکەیەی کە هەڵگری هەردوو ئەلیلی A , h بووە،لە ئەنجامدا ئەو منداڵە دروست بووە کە جینۆتایپەکەی بریتییە لە : H/h , A/O، کە رووخسارە بابەتەکەی بە A دەردەکەویت لەبەر بوونی ئەلیلی H، بەڵام دایکی ئەم بۆهیلەی نەبووە، لەبەر ئەوە ئەلیلی A نەیتوانیوە رووخسارە بابەتەکەی دەربخات، بۆیە بەپشکنینی ئاسایی کچەکە بە O دەردەکەویت.

*بەواتایەکی دی بۆ هیلی h/h تەنها کاری لەسەر رووخسارە بابەتی جینەکان کردووە نەوەك لەسەر بۆماوە بابەتەکە. ...و دەرکەوتووە کە ریگریتی ئەم بۆهیلە تەنها بۆ سیستمی ABOو فینۆتایپی دەردانە (Secretors)، ئەمەش دەشێت بۆ ئەوە بگەرێتەوە کە دژ پەیداکەری سیستەمەکانی دی، وەکو: Rhو Xgو Kiddو Kell...هتد، پێشینە ماددەیان جیاوازە لە هی ABO. جگە لە جیاوازیان لە بۆماوە لۆکەسدا.

| یەکێك لە منداڵەکان | | کچ | | کور | |
|---|---|---|---|---|---|
| رووخسارەبابەت | بۆماوەبابەت | رووخسارەبابەت | بۆماوەبابەت | رووخسارەبابەت | بۆماوەبابەت |
| گروپی A | A/O | گروپی O | A/- | گروپی B | B/O |
| | H/h | (بۆمبای) | h/h | | H/- |

## سەرچاوەکان:

1-Cumming, M.R. and W.S. Klug (1997). concepts of Genetics (5th ed).
2-Friedman, J.M. and F.J. Dill(1996). Genetics (2nd ed.). NMS.
3-Mange, E.J. and A.P. Mange (1990), Genetics: Human aspects (2nd ed).
4-Poctor, S.J. and R.B. Thompson . (1979). Ashort teytbook of Haematology (6th ed). Ptman Ltd.

# پێشنیازی پرۆژەیەک بۆ پیشەسازی کاغەز و کاغەزسازی ...!

جەمال عەبدول

**لە پێناوی بنیادنانی زەمینەیەکی پیشەسازی لە کوردستاندا، و بەمەبەستی بیرکردنەوە لە دروستکردنی پێدوایستیە گرنگەکانی خەڵکی کوردستان گۆڤارەکەمان وای بەباش زانی بنچینەی زانستی یەکەیەکەی هەندێك لەو پێداویستیانە بخاتە بەردەم دڵسۆزانی نەتەوە، و ئەم جارەش بۆ ئەو مەبەستە ڕومان لە مامۆستا (جەمال عەبدول) کرد کە دەربارەی پیشەسازی کاغەز، و بیرکردنەوە لەدروستکردنی لە کوردستاندا وتارێکمان بۆ بنووسێت.**

**بەو هیوایەین کە ئەمە هەنگاوێك بێت بۆ جوڵاندنی ئەم گۆمە مەنگەو کاریگەری ڕاستەوخۆی خۆی هەبێت.**

**زانستی سەردەم**

کاغەز، چنراوێکی ڕیشاڵو ڕیشاڵۆچکەی سێلولۆزی، بەهایدرۆجینەبەند (بەندی هایدرۆجینی) پێکەوە بەستراون، دەتوانرێت، هەموو مادەیەکی سروشتی بنەما سێلولۆزی وەك گوش، قۆزاخەی لۆکە، زەل، کرۆكو نێرکی دار، بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێندرێت.

ئێستا ٩٠٪ زۆرتری کاغەز، لە کرۆك و نێرکی دار دروست دەکرێت، کە ڕیشاڵی (٠,٥-٣) ملم ی تێدایە، گیرساوەی ٢٪ی ڕیشاڵ، بەخێرایی دەبڕدرێت (دەهاڕدرێت) بۆ بەشە تێکشکاندنی دیواری خانە پێکهێنەکان، ڕوودانی ئاوە شیبوونەوە (خووسانو هەڵئاوسانی ڕیشاڵەکانو تێکشاندنی هایدرۆجینە بەندی نێوان سێلولۆز- سێلولۆز) و خێرا بڕینەکە (هاڕین) دەبێتە هۆی وردکردنی دیواری خانەکانو پەیدابوونی ریشالۆکە، کە لە داوە (ریشالە) سەرەتاییەکە جیادەبنەوە، کوتاندنەوەی گیرساوەکە، دەبیتە هۆی بڵاوبوونەوەی بەسەر لوولەکیکی کونکونی خولاوەدا (بۆ لی چۆڕانەوەی ئاوەکە)پەرەکە، یان لبادیك دروست دەبیت، کە ئەویش بەهۆی کردنەوەو کوتاندنو پەستانەوەو بەهیزی یەکگرتنو پیکداچوونی ریشالو ریشالۆکەکانو پیکەوە نووسانیان بەهۆی هایدرۆجینە بەندەوەو بەکۆمەکی رووکرژی ئاوە مژراوەکە بەهۆی کاریگەریی بۆ شاندنەوە، ئەو حەسیرە ریشالە دەگۆردریت بۆ کاغەز، رەوشی کاغەزە پەیدابووەکە پابەند بە ریزبوون و ریکخستنی ریشالۆکەکانەوەو دەیشتوانریت ئەو رەوشانە، بەتیکردنو رووپۆشینی هەندیك مادە کە هەویرەکە، باشتر بکریت.

(وەك چڕی، هاوکۆلکەی جیڕی، خۆراگری (بە تایبەتی لەکاتی تەڕبووندا) و دانەدان، ڕەنگ، بریسکە، شلمژین‌و گونجان بۆ چاپسازی.. تاد).

لە ئۆسراند (Osrand) کە شارۆچکەیەکی بچووکی وڵاتی سویدە، کەڵەکارگەیەکی سیلولۆز بەرهەمهێنان هەیە، ساڵانە ملیۆنێك تۆن بەرهەم دێنێت‌و، بۆ گەیشتنە ئەو بەرهەمە زۆرە، پێویستی بە سێ چوار ملیۆن درەختی ٢٠ مەتر بەرز هەیەو بەرهەمی جیهانی سیلولۆز، بەنزیکەی ٣٠ ملیۆن تۆن لە ساڵێکدا دەخەمڵێندرێت‌و، لەڕاستیدا ئەم مادە بنچینەییە، کەمادەی سەرەتایی کاغەز سازییە، لە دروستکردنی ئاوریشمی دەستکردو فلیمی وێنەگرتن‌وفلیمی سینەماو هەموو بابەتەکانی سیلولۆید (باغە) و باروتە لۆکە (نایترۆ سیلولۆز)و سیلۆفان‌و دارنیش‌و سەدان کەرەسەی پێویستی دیشدا بەکاردێت.

لەڕووی کیمیاییەوە، سیلولۆز، لە کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین پێك دێت، واتە ئاوێتەیەکی کاربۆهیدراتییەو پێکهاتنەکەی تاڕادەیەکی زۆر، لەنیشاستە دەچێت، لە بەکارهێنانی کردەییدا، گەردە دەزوولەییەکانی لە ژمارەیەکی زۆر گەردی گلوکۆز پێك دێت.

سیلولۆزی پاك، لە سروشتدا نییە، تەنها لەو ڕیشاڵانەی قۆزاخەکانی لۆکەدا نەبێت کە دەوری پەموانە (تۆوی لۆکە) یان داوە، بەڵام لە ڕووەکەکانی دیدا، لەگەڵ هەندێك مادەی دیکەدا تێکەڵە، وەك دارکن (Lignin)، سیلولۆز دیمەنێکی ڕیشاڵی هەیەو ڕەنگەکەی سپییەکی بێگەردە و کێشی جۆرییەکەی (١,٥٤)ە.

سیلولۆز، بەخاوی سەرەکیی کاغەزسازیی دادەنرێت، کە بەشێوەی ڕیشاڵ (داو) لە جۆرەها ڕووەکدا هەیەو دیواری خانەکانی ڕووەك پێك دێنێت، بەشێوەی داوی باریك‌و نیان (Bast fibers) و دار هەیە لە هەندێك ڕووەکی دیاریکراودا، وەك داوی لۆکەو پاشەڕۆ کشت‌و کاڵییەکان‌و تلپەی زەل‌و قامیش‌و کەپەکی برنج (چەڵتووك)و کای گەنم‌و دانەوێڵەو ..تاد.

ڕیشاڵەکانی لۆکە، بەخاوێنترین جۆری سیلولۆز دادەنرێت‌و نزیکەی ٨٦-٩٨٪ سیلولۆزی تێدایەو بەستراوە بەدار و هەندێك پێکهێنی لیگنین‌و نیمچە سیلولۆزو کەمێك مادەی دیکەوە.

ڕێژەی سیلولۆز، لە زۆربەی خاوە بەکارهێندراوەکانی کاغەزسازیدا بەمجۆرەیە:

| خاو | ڕێژەی سەدیی سیلولۆز |
|---|---|
| لۆکە cotton | ٩٨ |
| گوشی سام (Ramie) | ٨٦ |
| گوشت Hemp | ٦٥ |
| وێنجە Jute | ٥٨ |
| دارەوشك Deciduous Wood | ٤١-٤٢ |
| دارە قوچەکان Coniferous woods | ٤١-٤٤ |
| لاسك‌وکای گەنم‌و جۆ و دانەوێڵە | ٤٢-٤٣ |

سیلولۆز، لە زۆر سەرچاوە دەردەهێندرێت، کە خانەکانیان، لەڕەوشە فیزیایی‌و کیمیاییەکانیاندا جیاوازن‌و پێکهاتنی خانە، لە کاغەزسازیدا زۆر گرنگە.

**دەرهێنانی سیلولۆز:**

هێشتا کیمیاگەران ڕێگەیەکیان بۆ بەرهەمهێنانی سیلولۆزی دەستکرد نەدۆزیوەتەوە، بەڵام ڕێگەی دروستیان دۆزیوەتەوە بۆ دەرهێنانی لە ڕووەك، سەرجەم ئەم ڕێگایانە پشت بەوە دەبەستن کە توێکڵی دەرەوەی قەدو لق‌و پۆپی ڕووەك بەهۆی هەندێك مادەی کیمیاییەوە شی‌دەبنەوە، کە کار ناکەنە سیلولۆز.

کردەی دەستخستنی سیلولۆز، زۆرو ئاڵۆزن، گرنگەکەیان ئەمەیە:

قەدی درەختەکان، دەبڕدرێن‌و دەهاڕدرێن‌و لەگەڵ هەندێك مادەی کیمیاییدا دەکوڵێندرێن کە توێکڵی دەرەوەیان شی دەکەنەوەو دوای لە ئاودا جیاکردنەوە، سیلولۆز وەك تۆپەڵە ڕیشاڵێك پێك دێت، کە پێویستە بشۆردرێت‌و سپی بکرێتەوەو وشك بکرێتەوەو بخرێتە بازاڕەوە.

ئەو ڕووەك‌و درەختانەی لەوانی دی زۆرتر بۆ بەرهەمهێنانی سیلولۆز بەکاردێن کاژ (سنەوبەر) و (تەننوب)ە، چونکە ٣٥-٤٥٪ی کێشی دارە وشکەکەیان سیلولۆزیان تێدایە.

**جۆرەکانی سیلولۆز:**

وەك باسمان کرد، سیلولۆز لەدرەختدا، پابەندە بە بڕێکی جیاوازی مادەییانییە کاربۆهیدراتییەکانی دیکەوە وەك نیمچە سیلولۆزو ئاوێتە ناکاربۆهێدەرەتیەکانی وەك لیگنین‌و ڕاتنجەمەنی‌و خوێ کانزاییەکان، جیاکردنەوەی پێکهێنە

بیانییەکان لە سیلولۆز، لە کاغەز سازیدا، کاریکی پێویستەو بوونی ڕێژەی زۆری ئەم پێکهێنانە لە هەویری کاغەزدا لە بابەتیو جۆرێتی کاغەزەکە دێنێتە خواریو کار دەکاتە ڕەوشە پەسەندو خوازراوەکانی کاغەز، بۆ جیاکردنەوەی سیلولۆز، ئامادەکردنی هەویرو ڕەنگبردنی بەکاردێت، کە چارەسەری فیزیاییو کیمیایین، بە بەکارهێنانی ڕێگەی تەکنۆسازیی جیاواز.

**هۆلۆ سێلولۆز Holocellulose**

سەرجەمی ئەو کاربۆهێدرەتانە دەگرێتەوە، کەپاش لابردنی لیگنین لە ڕووەکدا دەمێننەوەو هۆلۆسێلولۆز، سێ جۆرە: سێلولۆزی ئەلفاو بێتاو گاماو دووڕێگەی بنچینەیی هەیە بۆ دیاریکردنی هۆلۆسێلولۆز:

أ-ڕێگەی کلۆر: بریتییە لە کارپێ لێککردنی برشتیدار Wood meal لەگەڵ گازی کلۆر، تا پێنج دەقیقەیەك، لە نقومگەیەکی بەفردا، ئینجا لەگەڵ توێنەری ٣٪ یەکە ئیسانۆلامین (monoethanolamine)، لە ٩٦٪ ئیسانۆڵدا کاریان پێ لێك دەکرێتو پلەی زۆرێنی (پەلمەرێنی) هۆلۆسێلولۆز دەپێورێت.

ب-ڕێگەی کلۆریت chlorite method: برشتی دارەکە، لەگەڵ تێکەڵێکی ترشی سرکەی (pH=4) و کلۆریتی سۆدیۆم لە ٧٨ پلەی سەدیدا کارپێ لێك دەکرێت، ئینجا پلەی زۆرێنی (پەلمەرێنی) دەپێورێت، وایز (Wise) بینی، کە ڕێژەی زۆرێنی (پەلمەرێنی polymerization ) هۆلۆ سێلولۆز لە داری خاودا (soft woods)، لە نێوان ٦٥-٧٥٪و لەداری سەختدا (hard woods)، لەنێوان ٧٠-٨٢٪ دادەبێتو دار ئەنتویی زیوی (white spruce)، نزیکەی ٧٣٪ سێلولۆزی تێدایە.

**ئەلفاسێلولۆز alpha cellulose**

زاراوێکە، بۆ ناوەڕۆکی سێلولۆزی ڕاستەقینەی خاوی ڕووەك بەکاردێت، لەناوەندێکی تفتدا و زاراوی ئەلفا بێتاو گاما، بۆ یەکەمجار کرۆسو براون بەکاریان هێنا. ئەلفاسێلولۆز، بە پێکهاتنێکی کیمیایی دیاریکراو دانادرێتو لەو سێلولۆزە پێك دێت، کە لە گیراوەی هایدرۆکسیدی سۆدیۆمی ١٧,٥٪ خەستو لە ٢٠پلەی سەدیدا ناتوێتەوە لە بارودۆخێکی تایبەتیدا.

**بێتا سێلولۆز beta cellulose**

ئەو بەشەی سێلولۆزە، کە لە گیراوەی ١٧,٥٪ هایدرۆکسیدی سۆدیۆمدا دەتوێتەوە، بەڵام ئەگەر گیراوەکە ترش بکرێت، دەنیشێت، باوەڕوابوو کە بێتا سێلولۆز لەداردا نییەو لە شیبوونەوەی ئەلفاسێلولۆز پێك دێت لەکاتی هەویر سازیدا.

**گاما سێلولۆز gama cellulose**

ئەوبەشەی سێلولۆزە، کە لە گیراوەی ١٧,٥٪ هایدرۆکسیدی سۆدیۆمدا دەتوێتەوە، بەڵام لەکاتی هاوکێشکردنی گیراوە تفتەکەدا، نانیشێتو بە بێتاو گاما سێلولۆز پێکەوە دەوترێت هێمیسێلولۆز.

ڕەوشە کیمیاییەکانی سێلولۆز:

سێلولۆز، لە زنجیرەیەکی ڕاستی پارچە گلوکۆزی نائاوی ($C_6H_{10}O_5$) پێك دێتو، هەر پارچە گلوکۆزێك، سێ کۆمەڵە هایدرۆکسیلی تێدایە، کە دوو کۆمەڵە کهولی دوانیو کۆمەڵەیەك کهولی یەکی، لە شوێنی ٢،٣،٦،دا بەرەودوا پێك دێت. پارچەکانی گلوکۆز، بەهۆی بەندی گلوکۆسیدی ئۆکسجینەوە پێکەوە دەبەسترێت، لە شوێنی یەکەم و چوارەمدا (glucoside oxygen bonds) پێکەوە دەبەسترێن، لە شوێنی یەکەم و چوارەمدا:

**هێلکاری بەندی کیمیایی**

کۆمەڵە کهولییەکانی گەردی سێلولۆز، پێڕەویی کارلێکە کهولییە نموونەییەکان دەکەن، وەك پێکهێنانی کهولو ئەستەرو ئۆکسان وەی دیش.

سێلولۆزی داریش، چەند کۆمەڵەیەکی کاربۆکسیلی تێدایە، کەوا لە سێلولۆز دەکەن، وەك ترشێکی یەکتفت ڕەفتار بکەنو لەشوێنی شەشەمدا بلکێت بە گەردی گلوکۆزەوە.

**هێمیسێلولۆز نیمچە سێلولۆز Hemicellulose:**

ئەو شەکرە مەنییە ناسێلولۆزییانەن کە لە داردانو، لە کاو پاشەڕۆی زەلو قامیشو حەیزەراندا هەیەو بەهیچ جۆرێك لە لۆکەی پوختەکراودا نییە، هێمیسێلولۆزو سێلولۆز، پێکەوە هۆلۆسێلولۆزی دار پێك دێنن.

هێمیسێلولۆز، لەم شتانەدا، لە سێلولۆز ناچێت:

١-توانای توانەوەی لە گیراوەیەکی تفتی چونیەكو ئاوی گەرمدا، پاش ئەوەی لەدار پێکهێنەکانی دی جیا دەکرێتەوە.

٢-بەکاری ترشە ڕوونە گەرمەکان شی دەبێتەوە بۆ شەکری پێنجی وشەشی، پلەی پەلمەرێنی هێمیسێلولۆز لەهی سێلولۆز کەمترەو دەکاتە، ١٥٥±١٥ لەچاو هی سێلولۆزدا، کێشی گەردیی سێلولۆز، (٤٠٠٠) یان زۆرترە،

هی هێمیسێلولۆز لە سنوری (٢٠٠٠٠) دایە، هێمیسێلولۆز، بەپێچەوانەی سێلولۆزەوە شی دەبێتەوە، بۆ تێکەڵێکی چونیەکی شەکرەمەنی، وەك شەکرە شەشییەکانی گلوکۆزو مانۆزو گالاکتۆز وشەکرە پێنجییەکان وەك زایلۆس و ئارابینۆس و ترشی گلوکۆرۆنیك (Glucoronic acid) و وەرگرتە مەسیلییەکان.

**لیگنین Lignin**

یەکێکە لەو پێکهاتە سەرەکییانەی لەداردا هەیەو، لەنێوان ١٧-٣٢٪ی کێشی داری وشك پێك دێنێت و، دابەشبوونی لیگنین لەنێوان ڕیشاڵەکانی داردا، ناچونیەکەو ئەو زانیاریانەی کە هەن دەربارەی ڕەوشە کیمیایی و فیزیاییەکانی تا ئێستا زۆرنین، بەهۆی:

أ-سروشتە کیمیاییە ئاڵۆزە هەمە جۆرەکانی بەشەکانی دارەوە.

ب-جیاوازیی پێکهاتنی لیگنین، لە بەشە جیاوازەکانی داردا و بەپێی تەمەنی دارەکەیش.

ج-گرانیی جیاکردنەوەی لیگنین، بێ ئەوەی ڕەوشەکانی بگۆڕدرێت.زۆربەی لیگنینی دار، لە توێنەرە سستەکاندا (Inert solvents) ناتوێتەوەو، بەگشتی دووڕێگەی سەرەکی هەیە بۆ جیاکردنەوەی لیگنین:

١-شیبوونەوەی سێلولۆزی دار، بەهۆی نوێنەری گونجاوی وەك ترشی گۆگردیك یان ترشی هایدرۆکلۆریك یان هی ترولیگنین وەك پاشەڕۆی نەتواوە، دەمێنێتەوە.

٢-کارپێ لێککردنی دار لەگەڵ لیگنینتوێنەرەوەکان، وەك کهولە هایدرۆکسیدی سۆدیۆم لە پلەی ١٧٠-١٨٠ی سەدیدا.

**پێکهاتنی کیمیایی لیگنین:**

ڕەوشە کیمیاییەکانی لیگنین، بەپێی ڕێگەکانی چارەسەری دارو جیاکردنەوەی، دەگۆڕدرێت، بەگشتی ڕێژەی پێکهێنەکانی لیگنین لەداردا بەمجۆرەیە:

٦٣,٥٪ کاربۆن، ٦,٠٪ هایدرۆجین، ١٥,٦٪ میسۆکسیل methoxyl، بڕی کاربۆن لە لیگنینی داری سەختدا، لەو ڕێژانەی سەرەوە کەمترەو، باوەڕوایە، کە لیگنین ناوکێکی ئارۆماتیی تێدایە، بەڵگەی ئەوەیش ئەوەیە کە بەلەناوبەرە دلۆپاندنی لیگنین (بێ هەوا گەرمکردن)، یان کارپێ لێککردنی لەگەڵ داخەسۆدا، یان لێکردنەوەی بەهۆی کارایەکی یاریدەدەرەوە، لیگنین لێك هەڵئەوەشێ بۆ ئەو وەرگرتانەی کە ناوکی بەنزینیان تێدایە، وەك کاتیکۆل Catechol و ڤانیلین Vanillin و سیرینگ ئەڵدیهاید Cyringaldehyde

**کرۆکەدار pulp wood**

دار، لە هەموو مادەکانی دی زۆرتر بۆ کاغەزسازی بەکاردێت، کە ٩٠٪ی ئەو ڕیشاڵانەی تێدایە کە بۆ ئامادەکردنی هەویری کاغەز بەکاردێت، لێکۆڵینەوەی کرۆکی دار، بەگشتی ئەم لایەنانە دەگرێتەوە:

**بابەتەکانی دار Species of Wood**

**بەگشتی، دوو بابەتی سەرەکی دار هەیە:**

أ-داری خاو، کەداری درەختە هەمیشە سەوزەکان دەگرێتەوەو پێیان دەڵێن تۆ و ڕووتەکان (gym - osperum).

ب-داریّ سەخت، پێیشی دەڵێن، درەختە تۆو پۆشراوەکان (angiosperm یان deciduous).

دەتوانین جیاوازیی نێوان پێکهێنەکانی هەردوو بابەتەکە لەم خشتەیەدا کورت بکەینەوە:

| | داری خاو | داری سەخت |
|---|---|---|
| درێژیی ڕیشاڵ بە (ملم) | ٥,٠-٢,٥ | ٢,٠-٠,٦ |
| ڕێژەی لیگنین | ٣٢-٢٥ | ٢٦-١٧ |
| ڕێژەی سێلولۆز | ٦١-٥٥ | ٦٤-٥٨ |
| ڕێژەی بێتوسان | ١٣-٨ | ٢٥-١٨ |
| چڕیی سەوزەدار | ٢٦-٢١ | ٣٥-٢٢ |
| جۆری ڕیشاڵ | بۆریچەیە | ڕیشاڵی دارە |

داری خاو، لەکاغەزسازیدا پەسەندترە لەداری سەخت، بەهۆی درێژیی ڕیشاڵەکانیەوە، ٨٥-٩٠٪ی بەرهەمهێنانی هەویری کاغەزی جیهان، لەداری خاو ئامادە دەکرێت.

داری خاو، لە سەخت چونیەکترەو بەزۆری ڕیشاڵ و بۆریچەیان تێدایە، بەڵام داری سەخت، جۆرەها دەمارو ڕیشاڵ و بۆریچەیان تێدایەو ڕێژەی شەکری پێنجی لەداری سەختدا زۆرترە.

**توێکاریی دار Anatomy of wood**

دار، تەنێکی خانەکیی کونیلەدارە و توخمە بنچینەییەکان لەداری خاودا، بۆریچکە tracheids ، دارك، خانەی لگینینی درێژکۆلەو نووکتیژن، درێژییان (٣-٥) ملم دەبێت و تیرەکەیان، تێکڕا نزیکەی (٠,٠٣) ملم دەبێت.

داری سەخت، لە داری خاو پێکهاتن ئاڵۆزترەو، بەگشتی دوو جۆر خانەی تێدایە، دارەریشاڵ و بۆرییەریشاڵ، دارەریشاڵ، لە خانەی دیوار ئەستوور پێك دێت و درێژییەکەی میللیمەترێك زیاترەو تێکڕای تیرەکەی نزیکەی ٠,٠٢ ملم، بەڵام بۆرییە ریشاڵ، لە کورتەخانەی دیوار ئەستوور تر پێك دێن، بۆریچەکان لە هەندێك داری سەختدا، زۆر گەورەن و لە شێوەی چەپك (گورزە)دان، لە جۆرەکانی دیدا ، قەبارەکەی رێك و پێکەو بەناو ئەڵقەی ساڵانەدا بەرێك و پێکی دابەش دەبێت.

ریشاڵە دارینەو بۆریچەو دارکەکان، لەدارو درێژی ریز دەبن و لەهەر بابەتێکیاندا، هێڵی باریك، خانە هەیە کە تیشکانە (تیشك ئاسا) بەداردا بڵاوبوونەتەوەو پێشی دەڵێن تیشکەخانە، لە هەندێك جۆری ناواخنەخانە دیکەدا (خانەی پارانکیمی) هەیەو دەشێت داری خاو و سەخت، خانەی پەرەیی راتنجیشی تێدابێت.

**رەوشە فیزیاییەکانی دار:**

رەوشە فیزیاییە گرنگەکان بۆ کاغەزسازی، چڕیی دارو رادەی شێ و رێژەی داری کرۆك (heat wood) بۆ داری هەڵچوون (sap wood) و رێژەی ئەویش بۆ هاوینە (Summer wood).

**چڕی دار (کێشی جۆری):**

کێشی جۆری، بەکارایەکی گرنگی دیاریکردنی جۆری هەویر لەداردا، دادەنرێت و بەستراوە بە ئەستوریی دیواری خانەو قەبارەی کەلێنەکانیەوە، کێشی جۆریی دار، لەنێوان (٠,٠٤-١,٤) ملم دایە بەپێی ناوەرۆکی شێی ئازادی هەر قەبارەیەکی سەوز (تەڕ)، یان کێشی شێی ئازاد، بۆ هەر قەبارەیەکی وشك دەپێورێت. کێشی جۆری لەباری یەکەمدا، بەدانانی دار تاکو هەڵدەئاوسێت و رێژەی شێیەکەی دەگاتە ٢٠-٣٢٪ دەپێورێت.

ناوەرۆکی شێ: داری تازە بڕدراو، رادەیەکی زۆر شێی تێدایەو دیواری خانەکان پاراون و هەندێك کەلێن پڕە لەئاوو، بەگشتی رێژەی شێ بەگۆڕدرانی بابەتی دارو دەرزی ساڵ و تەمەنی درەخت دەگۆڕدرێت و لەنێوان ٢٠-٣٢٪ دایەو، دەتوانرێت، شێ بەرێگەی دڵۆپاندن بەهۆی تۆلوینەوە دیاری بکرێت.

**داری کرۆك و داری هەڵکشان Heart wood and Sap wood**

داری هەڵکشان، بەوریشاڵە تازە گەشەکردوانە دەڵێن، کە دەکەونە چینەکانی دەرەوەی قەدی درەخت، داری کرۆك، پیرە خانەکانی ناوەندی درەخت دەگرێتەوەو داری کرۆك، وردە وردە، زۆربەی قەبارەی دار دەگرێتەوەو خانەکانی نزیکە مردوون و تەنها وەك کۆڵەکەو راگرێکی درەختەکە وایەو مادە پیستەسازو چەسپییەکانی تێدایەو بەگشتی دەتواندرێت لەزۆربەی درەختدا ئەو دووبابەتە بە باشی لێك جیابکرێنەوە، داری هەڵکشان لەهەی کرۆك باشترە بۆ کاغەزسازی و رەنگەکەی کاڵترو سووکتریشەو، توانستی دادانیشی زۆرترەو کەمترین بڕ لیگنین و خۆڵەمێش و راتنج و چەسپ و خەوشی تری تێدایەو رادەی شێی زۆرترە.

**پێکهێنە ناوەنجییەکانی دار:**

دار، پێنج پێکهێنی بنچینەیی تێدایە، سێلولۆزو نیمچە (هێمی) سێلولۆز لیگنین و کانزامەنی و پوختەکراوەکان، لە پێشەوە باسی سیانەکەی یەکەممان کرد، پوختەکراوەکان، ئەو ئاوێتانە دەگرێتەوە کە لە توێنەرە سروشتییەکاندا (وەك ئیسەر وبەنزین و ئاو) دەتوێتەوەو نزیکەی ٣-٨٪ی کێشی دار پێك دێنن و رۆنەمەنی و راتنج و چەوری و چەسپ و مادە پێستە سازەکان و شەکرو نیشاستەو بۆیەو پێکتین و پرۆتین و ترشە ئەندامییەکان دەگرێتەوە، راتنج و چەورەمەنی و ترشە ئەندامی و رۆن و پیوو ستیرۆڵەکان (کهولە بلوورەکان)، بە هۆی ئیسەرەوە دەردەهێندرێن و، بە بەکارهێنانی تێکەڵێکی (٣٣قەبارە) کهول و (٦٧ قەبارە) بەنزین، مادە پێستەسازو رۆن و پیوو ئەو راتنجانەی لە ئیسەردا ناتوێتەوە، دەردەهێندرێن و بە بەکارهێنانی ئاوی گەرم (٢٣ پلەی سەدی) و تا (٤٨) سەعات، دەتوانرێت کاربۆهێدرات و خوێ و هەندێك ترشی ئەندامی دەربهێندرێن.

**راتنج و پیوومەنی:**

داری خاو، رێژەیەکی دیاریکراو، راتنجەمەنی تێدایە، کە رێژەو جۆرەکانی بەجیاوازیی جۆری دارەکەو شوێنی گەشەکردنی دەگۆڕدرێت، راتنجەمەنییەکان، بە زۆری لەشێوەی ترشی ئەندامیدان و، دوو جۆرن، ئەبیتیك Abietic و پیماریك Pimaric، ترشە ئەبییتییەکان ئەو ئۆکسانانەیان تێدا روودەدات، کە بەهۆی بەندی دوانییەوە روودەدەن. ئەو ترشە ئەندامییانەی لەداردا هەن، بەزۆری ئۆلیئیك Oleic و لینۆلیئیك Linoleic ن و کە بەشێوەی ئەستەرهەن، لکاون بەگلیسیرینەوە.

**ئاوێتە پێستەسازەکان Tannins:**

ئەستەری ترشە پێستەسازەکان دەگرێتەوە، لەگەڵ شەکری گلوکۆزدا، باوەکانیان: گالۆتانین Gallotannin و

دیگالیك Digallic دەتوانرێت ئەم ئەستەرانە بەهۆی ئاوەوە دەربهێندرێت و لە ناوەندێکی ترشدا، شی دەبێتەوەو یەکێکە لەکارالێکەرەوە بەهێزەکان.

مادەی پێستە سازی دی هەن، کە نەبەستراون بە شەکرەوەو بە پێچەوانەی یەکەمەوە، لە ناوەندی ترشدا شی نابێتەوە، بەڵکو لەگەڵیدا خەست دەبێتەوەو، مادەیەکی پۆلیمەری کێشی گەردی زۆرپێك دێنێت، کە وردە وردە لەناو هەمان ناوەندی ترشدا دەنیشێت، بەم پۆلیمەرە نەتواوانە دەڵێن: فلۆبافین Phlobaphene.

**بۆیەمەنی Dyestuffs:**

هەموو دارێك برێکی کەم ئاوێتەی ئەندامیی ڕەنگداریان تێدایەو، هۆی بوونی ڕەنگ، بەزۆری بوونی کاتیچین Catechins و فلاڤۆنۆڵ Flavonolsو نەفساکونیۆن Naphthaquinones و زانسۆن Xanthones و ئەنسۆسیانینەکان Anthocyanins ن، بەزۆری دەتواندرێت لەکاتی ئامادەکردنی هەویری کاغەزدا، خۆمان لەو ڕەنگانە ڕزگار بکەین و لایان ببەین.

**پەکتین و خوێ کانزاییەکان:**

پەکتینی ڕاستەقینەی دار، لە ئەستەری فرە جۆر پێك دێت، وەك پۆلی گالاکتورۆنیك Polygalacturonicی شەکرە مەنییەکانی ئارابینۆس و گالاکتۆز وڕێژەی پەکتین لە فەریکەدارەکاندا، لە پیرەدارەکان زۆرترەو ڕێژەی لەداری سەختدا، لە داری خاو زۆرترەو لە هەموو بارێکدا ڕێژەکەی لە ١,٥٪ی کێشی دارەکە تێپەڕناکات.

زۆربەی ئەو خوێ کانزاییانەی لەداردا هەن، بەستراون بەپێکهێنە ئەندامی و نائەندامییە نەتواوەکانەوەو بریتین لە خوێیەکانی کالسیۆم و پۆتاسیۆم و مەگنیسیۆم و سۆدیۆم و ئاسن و ئەلەمنیۆم و مەنگەنیزو خوێیەکانی کلۆریدو گۆگردات و ئۆگزالات و فۆسفاتیشی تێدایەو ڕێژەی خۆڵەمێش بەگشتی لەنێوان ٠,٢-١,٠٪یە.

**هەویرسازی Pulping**

هەویرسازی، یەکەم هەنگاوە لە کاغەزسازیداو، کوڵاندنی خاو (دار)ە لەگەڵ ئاوێتە کیمیاییەکان لە هەر سگەکان Digestersو لە پلەی گەرمی و پەستان و کاتی گونجاوداو.

سێ ڕێگەی سەرەکیی هەویرسازی هەیە، بەکورتی ئەمانەن:

١-ڕێگەی کیمیایی: کوڵاندنی ئاردەدارە، لەگەڵ مادە کیمیاییەکاندا، بۆ لێ جیاکردنەوەی لیگنین و پێکهێنە خەوشەکانی دی و پوختەکردنی هەویرەکە، لەڕێگەی کیمیاییدا، بەرهەم بەزۆری کەمترە لە هی ڕێگەی میکانیکی، بەڵام هەویرەکەی خاوێنتر دەبێت و ریشاڵەکانی سێلولۆزیش کەمتر بەفیڕۆ دەچن، ڕێگە کیمیاییەکان، ئەمانەن:

ڕێگەی سۆدا Soda process، ڕێگەی گۆگردات Sulfate (Kraft) process ،ڕێگەی ترشە گۆگردیت Acid Sulfite Process وڕێگەی ترشە گۆگردیتی هاوکێش Natural Sulfite process

ئەو ئاوێتە کیمیاییانەی بۆ هەر ڕێگەیەکیان بەکاردێت، ئەمانەن:

| ڕێگە | ئاوێتەی سەرەکیی کارا | ئاوێتەی ناوەندی |
|---|---|---|
| ١-ڕێگەی سۆدا | NaOH | $Na_2CO_3$ |
| ٢-ڕێگەی گۆگردات | $NaOH, Na_2S$ (NaHS) | $Na_2CO_3$ |
| ٣-ڕێگەی ترشە گۆگردیت | $H_2SO_3$ ($SO^3$) | $NaHCO_3$ |
| ٤-ڕێگەی گۆگردیتی هاوکێش | $Na_2So_3$($NaHCO_3$) | $NaHCO_3$($Na_2CO_3$) |

٢-ڕێگەی میکانیکی: گۆڕینی دارو خاوەکانێتی بۆ ریشاڵ، بەئامێرهاڕ، بەرهەمی هەویرەکە زۆرە (٩٥٪) بەڵام کەمخاوێنەو ریشاڵەکانیش زۆر ورد دەبن و بەفیڕۆ دەچن.

٣-ڕێگەی نیمچە کیمیایی Semichemical Pulping: پێکەوە تێکەڵکردنی هەردوو ڕێگەی کیمیایی و میکانیکییە.

دوای ئەوە، نۆرە دێتە سەر شتنەوەی هەویری کوڵاندن، تفتە هەویرسازی، ڕەوشی تفتە هەویری کوڵاندن، گێڕانەوەی (دەستخستنەوەی) مادە کیمیاییەکانی تفتەگیراوەکانی کوڵاندن، هەویرسازیی میکانیکی، پێداویستیەکانی، ڕەوشی هەویری داری هاڕدراو، هەویرسازیی نیمچە کیمیایی، ڕێگەی تەرەسووت، ڕێگەی وشکەسووت، ڕێگەکانی دیکەی هەویرسازی، ڕەنگبردن (سپیکاری)، پێدوایستییەکانی، تاقیکردنەوەی توانستی لێکردنەوە بەهایپۆکلۆریت، کلۆرە ژمارە، پەرمەنگەناتە ژمارە، پێکهاتن و ڕەفتاری سیستمی کلۆر-ئاو، بەقۆناغیك ڕەنگبردن، بەهۆی هایپۆکلۆرینەوە، کاری هایپۆکلۆریت لە لیگنین کاری هایپۆکلۆریت لە کاربۆهیدرەیت، بەکلۆر پوختەکردنی هەویر، ڕەنگبردن بە دوانۆکسیدی کلۆر، ئینجا پاش تەواوبوونی کردەکانی

نووشتاندنەوەی هەبێت تا بتوانرێت بەهۆی رۆکێتەوە بەرەو بۆشایی ئاسمان هەڵبدرێت.

**سەرەتای گەشتوگوزاری فەزایی:**

لەو کاتەوە کە کەشتیوانانی ئەپۆلۆ لە حەوت گەشتی نێوان ساڵانی ١٩٦٢-١٩٧٢دا توانیان لەسەر رووی هەیڤ دابەزن، هەر لەوکاتەوە، کۆمپانیا گەشتوگوزارییە ئەمەریکییەکان خەریکی پروپاگەندەن و هاوار هاوارییانە، خەلکینە لە ئێستەوە بلیتی کورسی گەشتوگوزار بۆ هەیڤ ببرن! پەیمانتان دەدەینێ پاش چەند دە سالیك گەشتەکەتان بۆ ریکدەخەین!! زۆربەی خەلك گاڵتەیان پێدەهات، کەچی لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٨دا، رووداویکی سەیر هێنانەدی ئەم ئاواتەی نزیکخستەوە! چۆن؟!

سیناتۆر (جۆن گلین)ی تەمەن (٧٧ ساڵ) بەشداری گەشتیکی ئاسمانی کرد لەگەڵ دەستەی کەشتیوانانی دیسکەڤەریداو نۆ رۆژی رەبەق بەتەندروستییەکی باشەوە لە بۆشاییی ئاسماندا مایەوە! بەمەش بواری راگەیاندن و پروپاگەندەی کۆمپانیاکان تەختتروفراوانتر بوو، هەر لەم بوارەدا، ئەمریکا لە (٤)ی یۆلۆی ساڵی ١٩٩٩دا گەشتیکی بەرەو خولگەیەکی نزمی دەوری زەوی ئەنجامدا، لەم گەشتەدا بەفرۆکەیەکی تایبەتی کەناوی (Civilian Astronauts Corps -CAC.1) بوو، چوارکەس کە یەکیکیان ژن بوو بەخیرایی (٢٥٠٠میل) لە یەك سەعاتدا دیواری دەنگییان بەزاندو تا (٧٠میل) لەرووی زەوییەوە بەرزبوونەوەو جگە لە تیپەراندنی باری کیشنەمان، توانیان بە ئارەزووی خۆیان ئەستێرەکان و دیمەنە قەشەنگەکانی دەوری گۆی زەوی ببینن.

لەم ساڵانەی دواییدا پروپاگەندەکردن سەبارەت بە گەشتوگوزاری ئاسمانی ولاتانی دیکەی وەك یابان و کەنەداو ئەلمانیاشی گرتەوە! بەپیی ئامارەکان ٧٠٪ ی خەلکی حەزیان لەم گەشتانەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە پیویستە هەر نەفەریك (١٢٠٠٠دۆلار) بدات!

بۆ ئەم مەبەستەش پلانی ئەنجامدانی گەشتیکی (٥رۆژ) خایەن دانراوە بە کەشتییەکی ئاسمانی ئوتیل ئاسا.

شایانی باسە کە ئیستا روسیا کەشتیوان بۆ ئیستگەی فەزایی (میر) نانێرێت. ئەم هەلە لە لایەن هەندیك کۆمپانیاوە قۆزراوەتەوەو ریکەوتننامەیەکیان لە فبرایەری ساڵی (٢٠٠٠)دا بەبری (٢٠ملیۆن) دۆلار مۆرکردووە، شارەزایانیش وا چاوەروان دەکەن، لەم ساڵانەدا هەندیك کەسی سەرکەش گەشتیك بۆ ئەم ئیستگەیە ریکبخەن کە لە پینج پاسی گەورە فراوانترە.بیگومان لەم سەدەیەی ئیستاماندا، گەشتوگوزاری فەزایی پەرەدەسێنێت و زیاتر گەشە دەکات بەتایبەتی کە کۆمپانیای (زیگراهم- Zegrahm)ی ئەمەریکی لەپروپاگەندەکانیدا هەلومەرجی پیویستی رەخساندوە لەبارەی پارەی راهێنان و نشینگەو پۆشاکی تایبەتی گەشتەکەو پشکنینی پزیشکی.. گەشتەکەش بە فرۆکەیەکی تایبەتی کەشتی هەلگر دەکرێت، گەشتیارانی ناو کەشتییەکە تا (٥٠٠٠٠ پیّ) بەرز دەبنەوە ئینجا بە مۆتۆرە تایبەتەکانی ئاراستەی خولگەیەکی بەرز دەکرێت و پاش چەند رۆژیك گەشتوگوزار، دلشادو کامەران بەرەو زەوی دەگەرینەوە!

Internet

---

## بۆنی خۆش
## کەم کەرەوەی ئازاری ژنانە

**لەندەن:**

بۆنەخۆشەکانی وەك گولاو بادەم بەهۆکاری یارمەتی دەری کەم کردنەوەی ئازار دادەنرین، بەلام وادەردەکەویت کە کاریگەرەکەی تەنها تایبەت بەژنان نەبیت لەو لیکۆلینەوانەی کە زاناکان لەزانکۆی کیبك لە کەنەدا کردویانە دەریان خست کە ژنان و پیاوان هەردوو لا هەست بە باشی دەکەن کاتیك ئەو بۆنەخۆشانە هەلدەمژن لەگەڵ ئەوەشدا بۆنی ناخۆشیان دانا کە کار لە خراپی توانایان دەکات، بەلام تەنها ئافرەتان ووتیان کە بەرئەنجامی ئازاری دەست خستنە ناو ئاویکی زۆر گەرم کەم دەبیتەوە بەهۆی هەلمژینی بۆنی خۆشەوە ئازارەکەش زیاتر دەبیت ئەگەر بۆنی سرکە یا بۆنی خۆشی دی هەلمژن. و ئافرەتان لەکاتی سوری مانگانەدا زیاتر هەستیارن بۆ بۆن وەك لە پیاوان، بەلام گۆڤاری نیوساینتسی زانستی ووتی ئەمە بەوە لیك نادریتەوە کە بۆچی ئازاری ژنان کەم دەبیتەوە بەهۆی بۆنی خۆشەوە زیاتر وەك لە پیاوان چونکە هەردوو توخمەکە وا دادەنریت کە ریژەکە تیایاندا یەکسانە.

گۆڤارەکە ووتی (ئەوەی ناسراوە کە هەستیاری باش بەرهەمی هەستی بەرکەوتنی ناوچەی بەشی پیشەوەی تویکلی دەرەکی میشك چالاك دەکات. و بەکار دەهینرین بۆ هەستی چەشتن و بۆن. بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە ئەم بۆنانە هۆکاری گۆرانی هەستەکان بن لە ریگای بەرکەوتن و ئازار و پلەی گەرمییەوە کە کاریکەنە سەر ئەم بەشەی میشك لە ژناندا.

ژیان ئەسعەد Internet

# مۆزیك و کۆمپیوتەر
# Cool Edit Pro v1.2

ئامادەکردنی: شوان مستەفا

ئەوەی لای هەموان ئاشکریە ئەوەیە کە کۆمپیوتەر لەم ڕۆژەدا توانیوێتی بەتەواوەتی لەناو هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیانی مرۆڤدا ڕۆبچێتو زۆر بەئاسانی کارەکانی ڕۆژانەمان بۆ جێبەجێ بکات. ئێستا دیاردەی دانانو داڕشتنی پرۆگرام گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە لەقۆناغی سەرسوڕمان تێپەڕ ببێتو هاوڵاتیان یاخود بابلێین بەکارهێنەرانیبەریزیش گەیشتونەتە ئەو ڕاستییەی کە چاوەڕوانییەك لەناو ناخیاندا دروست ببێ بۆ دانانو جێبەجێکردنی هەموو جۆرە پرۆگرامیکی تایبەت بەکارە جیاجیاکان. بێگومان سەرەتای دروست بوونی کۆمپیوتەر بەم شێوازەی ئێستا پێکەوتوو نەبوو بەلکو سنووردار بوو بەڵام لەم قۆناغەی ئێستامانەدا دەتوانم بلێم زانستی کۆمپیوتەریش توانی وەك هەموو بوارەکانی هونەر بەتایبەت (مۆزیك) ئەندازە ببڕێتو بێ سنوور بێت لەبەرئەوەی بەهۆی ئامێری کۆمپیوتەرەوە دەتوانین باشترینو چاکترین کاری تۆمارکردنو گۆڕانکاری مەبەستی یەکە بەیەکەی تۆنەکانی مۆزیكو گۆڕانیکی هیجگار فراوانی دەنگی ئامێرەکان ئەنجام دەدرێت جگە لەپاکی کارە مۆزیکییەکەو چەندین خالی زۆر گرنگ وەك:

١/ ژمارەی تراکاتی مۆزیکی بێ سنوورە:-

لەراستیدا کیشەی (تراك) گەورەترین کیشەی

هونەرمەند بوو بەتایبەتی بۆ ئامێر ژەنەكان جاران پێویست بوو كە هەموو ئامێر ژەنەكان (عازف) لەناو ژوورێكی تایبەتدا ئامادەبن پێكەوە لەگەڵ گۆرانی بێژدا پاشان پێكەوە بەرهەمەكەیان تۆمار دەكرد ئەم كۆبونەوەیش چەندین كاریگەری خراپی لەسەر ئەو بەرهەمە دروست دەكرد لەوانە:

أ/ تێكەڵ بوونی دەنگی هەموو ئامێرەكان لەڕێگەی (Mic) ی یەكترەوە.

ب/ ڕێژەی (هەوا) لەگەڵ تۆماركردندا زۆر دەبوو لەبەرئەوەی ژمارەی (Mic) ەكان زۆر بوون.

ج/ بێزار بوون و هیلاك بوونی هەموو ئامێر ژەنەكان چونكە ڕەنگە لای هەمووان ئاشكرا نەبێت بەڵام ڕاستی تۆماركردنی تەنها بەرهەمێك لەوەدایە كە بەلایەنی كەمەوە چەندین جار ئەو بەرهەمە دووبارە دەكرێتەوە جا بەهۆی هەڵەی دەنگی بێت لەلایەن گۆرانی بێژەوە یاخود هەڵەی مۆزیكی بێت لەلایەن ئامێر ژەنەكانەوە یاخود هەڵەی ئامێری تۆماركردن بێت یاخود لەهەندێ كاتدا جوڵانەوەو دەنگە دەنگ و كۆكین و بەركەوتنی هەر شتێك بە (Mic) لەهەریەكێك لەم حاڵەتانەدا دەبوو لەسەرەتاوە ئەو بەرهەمە لێ بدرێتەوە تا كۆتا.

د/ كەمی ژمارەی تراكەكان سەرەتا لەسەر یەك تراك كار دەكرا پاشان زیاد كرا بۆ دوو پاشان چوار پاشان شەش و هەشت تا شانزەو سی و دوو بەڵام تاوەكو ئێستاش لەكوردستانی خۆماندا هیچ ئامێرێكی دەنگی وەك (میكسەر) نییە كە لەسەروو سی و تراكەوە بێت حاڵی حازر هەشت تراك هەیە.

تراك:- بریتیە لەخەتێك یاخود ڕێچكەیەكی جیا و تایبەت كە تیایدا ئامێرێك یاخود دەنگێكی تێدا تۆمار دەكرێت. ئەم تراكە تەنها تایبەت دەبێت بەو دەنگە بۆ نموونە چۆنێتی تۆماركردنی بەرهەمێكی مۆزیكی دەخەینە ڕوو.

سەرەتا ڕیتم (Metronome) (ڕیتمێكی مەوزون) بۆ ئامێر ژەنی سەرەكی دادەنرێت كە هەستاوە بەئامادەكردنی ئەو پارچە مۆزیكە لەتراكی یەكدا پاشان بەهۆی هێتفۆنەوە تراكی ژمارە یەك دەدرێتە گوێی ئامێر ژەنەكە ئەویش لەسەر ئەو ڕیتمە ئاوازەكە عەزف دەكات بەڵام لێرەدا ڕیتمەكە تۆمارناكرێت بەڵكو دەنگی ئامێرەكە بەتەنها لەتراكی دوودا زەخیرە دەكرێت پاشان تراكی یەك و دوو Play دەكرێت و دەدرێتە گوێی ئامێر ژەنەكە بۆ خستنە سەری تراكی سێ گەر سێتێك كەمانچە بێت ئەوا هەر لەڕێگەی تراكاتەوە ئەو ئامێر ژەنە بەتەنها دەتوانێت چەندین كەمانچە لێ بدات بەتەنها و هەمووشیان پێكەوە لێ بدرێتەوە بەم شێوازە ئامێرەكان یەكە بەیەكە تۆماردەكرێت و لەگەڵ هەموو تۆماركردنێكی تراكێكی نوێ هەموو تراكەكان Play دەكرێن و تراكی نوێش Rec دەكرێت بەم شێوازە دەتوانرێت بەرهەمێكی نوێ تۆمار بكرێت.

هەروەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێكرد یەكێك لەكێشەكان تراك بوو بەڵام ئامێر كۆمپیوتەر زۆر بەسەركەوتوانە توانی ئەم كێشەیەو هەموو كێشەكانی تری بەرهەمێك لەكاتی تۆماركردندا چارەسەر بكات هەر بەهۆی پرۆگرامی تایبەتەوە توانراوە ژمارەی تراكەكان زیاد بكرێت هەر لە 1) Track) ەوە تا (1000 Track) واتە لێرەدا تەنها ئامێر ژەنێك دەتوانێت (1000) جار و هەر جارێكیش بەجۆرێك و بەئامێری جیاوازیشەوە مۆزیكێك بەتاقی تەنها تۆمار بكات. جگە لەوەی

كـە دەتوانێـت لـەچ (بـاڕێك) ی مۆزیكیـدا هەڵـەی كردبێـت تەنـها لـەو بـاڕەدا دەسـت بـەلێدانی ئامێرەكـەی بكاتـەوەو هیـچ پێویسـت ناكـات لەسـەرەتاوە وەك جـاران ئـەو پارچـە ئـاوازە لێ بدرێتـەوە. ئەمـە تەنـها خـاڵێكی ڕەنگـە هێجگـار بچـوك بێـت لەئاسـان كاریيـەكانی زانسـتی كۆمپیوتەر بۆ مۆزیك هەر بەهۆی ئەم ئامێرەوە ئەو هونەرمـەندەی كـە ئـەو پارچـە ئـاوازەی دانـاوە سـەرەتا پـەیوەندی بەسـتۆدیۆیەكی تایبەتـەوە دەكـات و لـەپاش دانـانی چـەند سـاتێك بـۆ تۆمـاركردن بەتەنـها یـاخود لەگـەڵ هـەندێ هونەرمەندی تردا ئاوازەكە تۆمار دەكـەن پاشـان ئەندازیاری دەنگی هەڵدەستێت بە (نصب) كردنی ئـەو ئـاوازە پاشـان لـەكۆتادا دەنێدرێـت بەشـوێن گۆرانی بێژدا ڕەنگە ئەم كردارە بەگۆشەی (180) پلە لەگەڵ جاران جودا بێت و جێگەی سەرسوڕمان بێت كە كۆمپیوتەر توانیوێتی لەگەڵ هەموو بوارە جیاجیاكاندا خۆی بگونجێنێت و هەموو كارەكانی ڕۆژانەو ژیانی مرۆڤیش بەپێی توانا بەڕێوە ببات.

هـ/ تێكچوونـی دەنگی گۆرانـی بێـژ بـەهۆی زۆری دووبارە كردنـەوەی بەرهەمەكـە. ئەمـەش دەبـووە هۆی ناخۆشبوون و بێ تاقەت بوونی ئەو گۆرانی بێژە لەبەرهەمەكـەی زۆر جـار بیسـتراوە كـە فـلان كەس زۆر بەبێ تاقەتی فلانە بەرهـەمی تۆمار كرد هۆكەشی یەكێكە لەم خالانە.

و/ نـەبوونی ئـامێر پێشـكەوتوو وەك (میكسـەر، مـایكروفۆن، وایـەری ستریۆ، فیش و نوێ و چـاك، نەبوونی هیچ جۆرە فلتـەرێك بۆ پـالاوتنی هـەموو هەواو دەنگە دەنگەیێك، نەبوونی ستۆدیۆیەكی زۆر تایبەت و ڕێك وپێك بەكاری تۆماركردنی دەنگی.

ز/ نـەبوونی ئـەندازیارێكی دەنگـی زۆر بـاش كـە بتوانێت مافی ئامێرەكان بەتەواوەتی بدات.

ح/ نەبوونی هـەندێ لەئامێرەكان یاخود نـەبوونی كەسێك كە ئەو ئامێرە مۆزیكییە بەكاربهێنێت.

ت/ ئامـادە نـەبوونی ئـامێر ژەنـەكان (لەزۆربـەی كاتدا).

٢/ جودا كردنەوەی هەموو باڕێكی مۆزیكی بەپێی وەزنی مۆزیكەكە خۆی.

٣/ سیستمێكی نوێیە (Digital).

٤/ كـەمی دووری نێـوان پارچـەكان و كـەم بەكارهێنانی وایەرو كێبڵ و فیشە.

٥/ تۆماركردن لەسەر نوێ ترین سیستم.

٦/ بەكارنـەهێنانی (شـریت-بـەكرە) كـە لەبەكارهێنانێكی زۆردا تێك دەچوو.

٧/ گۆڕینی چینی دەنگی ئامێرەكان لەگڕ بۆ تیژو بەپێچەوانەشەوە.

٨/ دانـانی چـەندەها كاریگـەری (Effect) ی دەنگی بۆسەر ئەو تۆماركراوە لەیەك كاتدا بەلام لەمیكسـەردا تەنـها یـەك جـۆر كاریگـەری لەیـەك كاتدا دەدرێت بە دەنگێك.

٩/ پێشـاندانی ئـەو تۆمـاركرلاوە لەشـێوەی خەریتەیـەكی تایبـەت (هێڵكـاری) بـۆ زانینـی بەهێزی و لاوازی دەنگە تۆماركراوەكە.

١٠/ كردارەكـانی Cut و Normal و Copy و Copy Link بەشێوازێكی زۆر ئاسـان ئـەنجام دەدرێت.

١١/ پەشـیمان بوونـەوە لـەو كارانـەی كەپێشـتر ئەنجامدان داون و گەڕانـەوەی چـەندین قۆنـاخ بـۆ دواوە.

١٢/ گۆڕینــی سیســتمی ئــەو فایلــە دەنگیــە بەگویرەی Format ی جۆراو جۆرو تایبەتمەند کردنی بە Byte ی جیاواز جیاواز.

١٣/ گۆڕینـــــــی Mono بـــــــۆ Stereo و بەپیچەوانەشەوە بەشیوازیکی Digital ی.

١٤/ دیـاریکردنی مـاوەی ئـەو فایلـە دەنگیـە بەشیوازی كات ژمیرو باری مۆزیکی.

١٥/ تاوانـای هەلگەرانـەوەی فایلـەکانی هەیـە لەراستەوە بۆ چەپ و بەپیەوانەشەوە.

ئەوەی جیگـەی سەرسـورمان بیـت ئەوەیـە کـە کارە ئەلکترۆنیەکان توانایەکی هیجگار سـەیریان هەیـە بـۆ ئـەنجام دانـی کـارە جیاجیاکـان واتـە پرۆگرامـــە ئەلکتۆنیـــەکان وەك پرۆگرامـــە میکانیکیـەکان نی‌یـە کـە جولەیـەکی تایبـەتی هەبیت و بەس لیرەدا کاری ئەلکترۆنی سیفەتیکی کشـانی هەیـە بـەپیی پیویسـت بـۆ ئـەنجام دانـی ئیشـەکان بـۆ نموونـە بەچـەندین ریگـەی جیـاواز دەتوانین سەرجەمی ژمارە (22) دەربهینین لیرەدا دیینـەوە نـاو بابەتەکـەی خۆمـان واتـە پرۆگرامـە کۆمپیوتەریـــەکان توانایـــەکی هیجگـــار زۆر گـــەورەتریان هەیـــە بـــۆ ئـــەنجام دانـــی کـــارە مۆزیکیـــەکان وەك لـــەئامیرە تایبەتـــەکان وەك (میکسەر) بۆ نموونە.

کاتیك فەرمانیکی نویٚ لەئامیریکی نویٚدا وەك (میکسـەر) زیـاد دەکریـت بەهـەمان شـیواز لـەناو پرۆگرامیکی نـویٚی کۆمپیوتـەریدا بەتوانایـەکی هیجگار گەورەتر بەرهەم دەهینریت و بواریکی زۆر فراوانـتریش دەرەخسـینریت بـۆ دەسـت کـاری کردنـی کارەکـان جگـە لـەدانانی چـەندین جـۆری جیاواز لەکاریگەریەکان. لەهەمان کاتدا لـەرووی ماددی‌یەوە کەمی تیدەچیت وەك لەدروست کردنی ئامیریکی تایبـەت وەك (میکسـەر) بـۆ ئـەو کـارە. رەنگە جۆرەکانی میکسەر گەلیك زۆربن و لەژمارە نەیەن ل بەرامبەر ئەم ئـامیرەش چـەندین جـۆری پرۆگرامــی تۆمــارکردنی دەنگــی هەیــە بــەلام لەژمارەدا کەمن لەهەمانکاتدا هەموو ئەو کارانەی کەمیکســەریك ئــەنجامی دەدات بــەم بــەزیادەوە جیٚبەجیٚیان دەکات بەلام سەر لیشـیواندنیك بـۆ بەکارهینـەر (ئەندازیاری دەنگی) دروست دەکـات بەوەی کە لەئامیری میکسەردا هەلبژاردەکان کەمن بـەلام لـەناو پرۆگرامیکـی کۆمپیوتـەریدا گـەلیك زۆرن و دەبنــە هــۆی دروســت بوونــی گومــان و قەلقیـــەك تـــا دەگەیتـــە ئـــەنجام و دەتوانیـــت کاریگەریەك Effect ی گونجاو دروست دەکەیت.

لەم بەشــەدا بەپیویســتم زانــی کــە چـــەند زانیاریـەکی کـەم لەسـەر پرۆگرامیکـی تایبـەت بەستۆدیۆی مۆزیك (تۆمارکردنی دەنگی) بنووسم تەنـها لەبەرەئـەوەی کـە کەسـانیکی زۆر کـەم کـار لەسـەر ئـەم پرۆگرامەدەکـەن و شـارەزاییان تییـدا کەمـە لەهـەمان کاتدا کەلینیکی هیجگـار گـەورەی لـەژیانی مـرۆڤ پرکردۆتـەوە بەتایبـەتی لـەناو هونەرمەنداندا، ئەم پرۆگرامـە لەتوانایدایـە 64) (Tracks زەخیرە بکات و دەشتوانیت هەر 64) (Tracks هکە بکاتە تەنها (Tracks 1) و 63) (Tracks ی تــر بــەتاڵ بکاتــەوەو ئامــادەی تۆمارکردن ببیت پیم باش بوو کە بلیم پرۆگرامی دی زۆرن کــە بواریکــی زۆر فراوانتریـــان بـــۆ رەخسـینراوە لـەناوەندی تراکـاتدا بـۆ نموونـە Cakewalk کـە لەتوانایدایـە (Tracks 256) زەخیرە بکات و دەشـتوانیت هـەر (Tracks 256) هکە بکاتە تەنها (Tracks 1) و (Tracks 255) ی دی خـالی ببیـت و ئامـادەی تۆمـارکردن ببیـت.

لەهەمان كاتدا پرۆگرامیكی دیمان هەیە بەناوی Voyatra كە لەتوانایدایە (1000 Tracks) زەخیرە بكات، ئەو پرۆگرامەی كە ئیمە مەبەستمان بیت تەنها

پرۆگرامی Cool Edit Pro v1.2 ە نەك Cool Edit 2000 هەرچەندە ئەم نەوە نوێیە لەتوانایدایە فایلاتی MP3 دروست بكات بەلاّم بەداخەوە كەوەك لەملاوە ئەم توانایەی پێ دراوەو لەنووەی 1.2 دا نییە بەلاّم دەبینین لەژمارەی Tracks ەكانی كەم كراوەتەوە لە (64 Tracks) ەوە بۆ (4 Tracks). پرۆگرامی CuBase یش هەیە بۆ كاری ستۆدیۆی مۆزیكی كە 16) Tracks) ەو نەوە نوێكەشی (32 Tracks) ە. ئەوەی جیگەی سەرنج بیت ئەوەیە كە تراكاتی زۆر لەبەردەست دایە بۆ كاركردن بەلاّم دەبینین لەزۆربەی ستۆدیۆكانی شاری سلیمانیدا جگە لە ستۆدیۆی مۆزیكی (شوان، سەفین) هەموویان كیشەی تراكاتیان هەیە. بۆ نموونە (ستۆدیۆی مۆزیكی سانا) لەتوانایدایە كە تەنها (8 Tracks) بەگۆرانییەكەدا بەكاربهینیت بەهەمان شیوە (ستۆدیۆی سەنتەری گەنجان) پیم باش بوو كە بلیم تاكە كاریكی مۆزیكیو گۆرانی كە ژمارەكانی گەیشتبیتە (54 Tracks) گۆرانییەكی هونەرمەند (دیاری قەرەداغی) ە كە لە (ستۆدیۆی مۆزیكی كۆمپیوتەری شوان) تۆماركراوەو بۆ سالی (2003) دەكەویت بازارەوە. بەهیوام ئەم نووسراوانەك بەسوود بن بۆ هونەرمەندان بەتایبەت چونكە زۆربەی بابەتەكانی دیم سوود مەند بوون بۆ بەكارهینەرانی كۆمپیوتەر نەك هونەرمەندان.

# نازپێدان لە منداڵیدا، شکستی بەدواوەیە لە گەورەییدا

شەرمن سەلاح
مامۆستای بایۆلۆژی

پسپۆڕە شارەزا دەروونیەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کەمێك شکستی هێنانی منداڵ، زیاتر بەهێزی دەکات و توانای زیاد دەکات بەرامبەر بە کێشەکان لە دواڕۆژدا، قاهیرە- ژنە پسپۆڕێکی میسری ئاگاداری کردینەوە لەوەی ناز پێدانی زۆر بە منداڵ لە لایەن باوك و دایکەوە کارێکی زۆر خراپە، بە پێچەوانەوە کەمێك شکست خواردنی منداڵ لە منداڵەکەدا، توانای خۆڕاگرتن و ئارامی بەهێز دەکات و زیاتر بەرگری کێشەکانی دواتر دەگرێت.

دکتۆرە کریمان بدیر مامۆستا لە کۆلیژی کچانی زانکۆی عین شمس رایگەیاند پیویستە هەر لە منداڵیەکی زووەوە، مندال لەسەر ئازادی رابهینریت و دەرفەتی هەڵەو راستکردنەوەی بۆ برەخسینریت، بۆ ئەوەی لە داهاتودا بەرگری شکستیەکانی ژیان بگریت.

ئەم پسپۆرە دایکان بەوە ئامۆژگاری دەکات (بەپێی رۆژنامەی ئەهرام). پیویستە هەر زوو منداڵ رابهینریت خۆی بە تەنها کاروبارەکانی خۆی بکات وەك جل و بەرگ لەبەرکردن، یا کۆکردنەوەی یاریەکانی، یا هینانی پەرداخیك ئاو بۆ خۆی، لەگەڵ ئەوەی کە پیویستە چاودیری و ئاراستەش بکریت.

پسپۆرەکە دەلیت: شتیکی خراپ نیە ئەگەر جارجارە منداڵەکە هەست بە شکستی بکات، چونکە ئەم شکستیە گیانی بەرەنگاری تیادا زیاد دەکات، و بیری دەخاتە کار و تاقیکردنەوەو ئەزمونەکە بەردەوام دوبارە دەکاتەوە، تا وردە وردە توانای تەواوی دەبیت بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا ببەستیت و لە پاشدا توانای دەبیت کە هاوریکانی خۆی هەلبژیریت و مامەلەیان لەگەلدا بکات.

هەولدان بۆ بەپیرەوەچوونی هەموو داخوازییەکانی مندال و جێبەجێ کردنیان بە خیرایی، مندال و دایك دلخۆش دەکەن، بەلام ئەم بەختیاریە زۆر ناخایەنیت چونکە لە پاشتردا رووبەرووی بەربەستەکان دەبیتەوە وەك حەزکردن لە مانەوە شەو و شەونخونی بۆ کاتی درەنگ لەگەڵ هاوریکانیدا یا داوای پارەی خەرجی خۆی پیش کاتی هاتنی هەموو ئەو داوایانەی دیکەش کە رۆژ بە رۆژ لەگەڵ گەورەبوونیدا فراوان و زۆر دەبن.

ئەو پسپۆرە لەو بروایەدایە کە جارە جارە دواخستنی جێبەجێکردنی پیداویستیەکانی منداڵەکە، کەسیتیەکەی پتەو دەکات، بە مەرجیك لەگەڵ دوا خستنەکاندا لیکدانەوەیەکی باشی بۆ بکریت و دایك شیوازی کارتیکردن بەکاربهینیت بەوەی نمونەی لەو بارەیەوە بۆ باسبکات کە بەسەر خۆیدا هاتوە

دکتۆرە بدیر لەو بروایەدایە ئەم ریگایە دەبیتە هۆی دروستکردنی کەسیکی بەتوانا، کەسیك کە زیاتر پشت بە خۆی ببەستیت و بروای بە خۆی بیت.

Internet

# یەکێک لە هۆکارەکانی خووگرتن بەمادە سڕکەرەکانەوە هاوڕێی خراپە

ئاشتی ئەحمەد

تۆژینەوەیەکی گۆڕەپانی میسری دەربارەی ئەو بارودۆخانەی کە پاڵ بە گەنج و لاوەکانەوە دەنێت ڕوو لە مادە سڕکەرەکان بکەن،دەریخست کە گرنگترین هۆکاری ئەو بارودۆخە هەبوونی هاوڕێی خراپە بەڕێژەی (٥٠,٣٪)، ڕۆڵی دەوروبەرو گرفت و تەنگژەکانی دیکەش بەڕێژەی (٢٩,٤٪)، دێت.

تۆژینەوەکە لەلایەن ڕاگری کۆلیژی خزمەتی کۆمەڵایەتی لە فەیوم (ئەحمەد مەجدی مەرجان) سەرپەرشتی کراوە، گرنگترین هۆکارەکانی خووگرتن بە مادە سڕکەرەکانەوە حەزکردن بەتێڕوانین و تاقیکردنەوە، بێجگە لە هاوڕێی خراپ و نەبوونی چاودێری و هۆشیارکردنەوەن.

٥٠٪ی ئەو نموونانەی تۆژینەوەکە دەریخستووە جەخت لەوە دەکەن کە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە ئاستی بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە کەمدەکەنەوە، بەڵام (٤١٪)ی نموونەکان بەپێچەوانەوە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بەهۆیەکی زیادکردنی گرفتەکە دادەنێن. بە ڕێژەی (٧٤,٢٪) نمونەکان سوورن لەسەر ئەوەی تەلەفزیۆن لەهەموو ئامرازەکانی دیکە زیاتر کاریگەری هەیە بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە، بەڕێژەی (٦٠٪) لەو بڕوایەدا بوون کە باسکردنی مەسەلەکانی ئەم دیاردەیە لە نێو فیلمە سینەماییەکاندا دەبێتە هۆی فێربوونی تاکەکان بەخووگرتنیان بەمادە سڕکەرەکانەوە.

لەبارەی هەستی لاوەکان بەرامبەر بینینی ئەو جۆرە فیلمانە (٣٥,٢٪) نموونەکانی تۆژینەوەکە جەختیان لەوە کردوە کە لاوەکان هەست بە بێزاری و ڕوخاندن دەکەن و (٣٣,١٪) یش هەست بە نەگبەتی دەکەن، لەکاتێکدا (٧,٤٪) هەستیان بە بەزەیی کردوە بەرامبەر ئەوانەی خویان گرتووە بە مادە سڕکەرەوەکانەوە.

لە ڕووی کۆبوونەوەی چەندین لاو لەو دانیشتنانەی مادە سڕکەرەکانی تێدا وەردەگرن، بەڕێژەی (٣٧,٩٪) نمونەکان ڕایانگەیاندووە کە خۆیان چوونەتە نێو کۆبوونەکەیانەوە، (٤٥٪) لەو بڕوایەدابوون فێربووەکان لە حاڵەتی بێئاگایدان و بەڕای (٣٢٪)ش ئەو کەسانەیان بەسەر خۆش لەقەڵەمداوە. هەروەها (٦٤,٢٪) دەڵێن خەڵکی بەچاوی ڕقەوە تەماشای فێربووان دەکەن، بەڵام (١٣,٧٪) ی نموونەکان دەڵێت ئەوکەسانە نەخۆشن و پێویستیان بەچارەسەر هەیە.

تۆژینەوەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە گەنج و لاوەکان لە هەموو کەسێك زیاتر ماوە یان هەیە بۆ فێربوون و مامەڵەکردن بەمادە سرکەرەکانەوە، هۆی ئەمەش دەورەبەرەکەیانە، بەتایبەتی لەنیو خویندکارانی زانکۆکاندا کە زۆربەیان لە حالەتیکی ئابووری باشدا دەژین، ئەگەرچی ئەمە ریگە لەوە ناگریت کە پیی دەلین (مادە سرکەرەکانی هەژاران). هەروەها وەرگرتنی ئەو مادانە زیاتر لە ناوچە میللیەکان و لە گەرەکە جیاوازەکاندا بەربڵاوە کەتیایاندا مادەی سرکەری دیکەشیان هەیە و کاریگەرییان ویرانکەرو کوشندەیە وەك خووگرتن بە بەنزین و سریش و کەتیرە مادەی ویرانکەری دیکەش.

دەربارەی خۆپاراستن لەم دیاردە دزیوە بەبروای تۆژینەوەکە خواست هەیە بۆ رووبەرووبوونەوەی لەریگەی دانانی سیاسەتیکەوە کە نەك هەربۆ چارەسەرکردنی دیاردەکە بەلکو بۆ چارەسەری ئەو گرفتانەش کەپویەندییان بەم دیاردەیەوە هەیە. لەلایەکی دیکەوە تۆژینەوەکە ئەو کۆت و بەندانەی خستۆتە روو کە دەکەویتە بەردەم چارەسەرکردنی گرفتەکە وەکو ئاست و توانای پیادەکردنی ئاسایشی و هەبوونی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیەکان و چالاکییە وەرزشییەکان و سەرجەم ریگەو ئامرازە نوییەکان و بەرنامە زانستیەکان بە جۆریك لەگەڵ هەموو قۆناغەکانی تەمەندا بگونجیت و گۆرانیکی باش و بەرجەستە بخولقینیت.

تویژینەوەکە داوای لە بەرنامە هوشیارکەرەوەکان کرد لەنیو یانەو بنکەی گەنج و لاوەکاندا ووتوویژکردن لەسەر مەسەلەو دیاردەکان سازبدەن بە ئامانجی راهینانی لاوان لەسەر تیکەڵ بوون و بەشداریکردنیان لە ووتویژەکان، هەروەها بۆ بەسەربردنی کاتی بیکاری لاوان لەنیو بەرنامە هونەری و راگەیاندنەکاندا لەپیناو روونکردنەوەی ئاستی مەترسییەکانی دیاردەی دزیوی وەرگرتنی مادە سرکەرەکان، لە هەمان کاتدا داوای هاریکاریکردنی لایەنەکانی راگەیاندن و بنکەکانی لاوان کرد پیکەوە بەرنامەی هونەری بخەنە روو و باس لە کیشەو مەترسیەکانی ئەم دیاریدەیە بکەن، بە جۆریك ئاستی هوشیاری لاوان بەرزبکەنەوەو ئاگادریان بکەنەوە لەو ویرانکارییەی لەو ریگەیەوە دوچاریان دەبیتەوە.

بیجگە لە ئامادەکردنی چەندین بەرنامەی راهینانی زانستی بە چالاکییە جۆراو جۆرەکانیەوە، تاوەکو سوود لە ووزەو توانای لاوان وەربگیریت و لە هەمان کاتدا لاوان کاتە بیکارییەکانیان لە بابەت و کاری گرنگ و سوود بەخشدا بەسەربەرن.

Internet

# چەند زانیارییەک دەربارەی پۆلێنکردنی دارو درەختەکانی کوردستان

سۆزان جەمال
موعیدە لە کۆلیجی زانست- زانکۆی سلێمانی

زانستی پۆلێنکردنی رووەك plant taxanomy یەکێکە لەو زانستانەی مێژوویەکی دێرینی هەیە، هەر لەو کاتەوە کە رووەك سەرچاوەی خۆراك و سوتەمەنی و پەناگە بووە بۆ مرۆڤ، مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئارەزووی رێکخستن و جیاکردنەوە دەکات لەو سەردەمانەوە مرۆڤ رووەکی جیاکردۆتەوە هەرچەندە لەسەر بناغەی سادەو بەپێی بەکارهێنەرەکانی بووە. سیۆفراستس Theophratus (٢٨٥-٣٧٠ پ.ز) یەکەم کەس بووە کە رووەکی بۆ چوار کۆمەڵە دابەشکردووە "گژوگیاو نیمچە درەخت و دەرخت و دار" لینایۆس Linnaeus (١٧٠٧-١٧٧٨ز) ناوی نا باوکی رووەك (Father of Botany) دوا بەدوای ئەمانیش و هەر لەوکاتەوە بەردەوام زانایان و شارەزایانی ئەم بوارە لە هەموو جیهاندا سەرقاڵی پۆلێنکردن و تۆمارکردنی ناوی رووەك بوون. بەڵام لەلای خۆمان تاکو ئەم سەردەمەی ئێستاکە بایەخێکی ئەوتۆ بەم لقە گرنگەی زانست نەدراوە هەرچەندە کوردستان ناوچەیەکی گەلێك دەوڵەمەندە بە جۆرەکانی رووەك و لەهەمان کاتیشدا بنەچەی زۆرێك لە جۆرەکانی رووەکە. تاکە پۆلێنی رووەکەکانی کوردستان کە تاکو ئێستاکە کرابێت هەر ئەو پۆلێنەیە کە لەگەڵ پۆلێنی بەشەکانی دیکەی عێراقدا بەناوی فلۆرای عێراقەوە لە ١٢ بەشدا کۆکراوەتەوەو هەموو بەشەکانیشی لەلای ئێمە دەست ناکەوێت.

ئەم فلۆرایە تونسند (شارەزا لە رووەکدا)و ئیڤان گیست (شارەزا لە رووەکەکانی عیراقدا) بەهاوبەشی سەباح عەبدو کەریم و (عەبدو حسین خەیات وعەلی راوی و کۆمەلیك کەسی دیکە نوسیویانەتەوە، هەر چەندە لە کاتی گەران و تۆمارکردنی ناوە کوردییەکاندا پشتیان بەستووە بە خەلکی ناوچەکانی کوردستان و هەندیك کەسانی شارەزا وەك رووەکناس خوالیخۆشبوو ئیسماعیل سەرهەنگ بەلام هیچ کەسیك لەم کوردانە ئەکادیمی نەبوون، واتا ئەو شارەزایانەی فلۆرای عیراقیان نوسیوە هەرچەندە لەبواری پۆلینکاری رووەکدا شارەزابوون بەلام شارەزای هەموو ناوچەیەکی کوردستان نەبوون یان هەندیك شوین هەرنەگەراون لەوانەیە مافی ئەوەمان نەبیت ناوی بنیین کەموکوری چونکە ئەو زانایانە ئەرکی گەورەو خزمەتی زانستی گەورەیان پیشکەش کردوین، بەلام دەکریت بلیین ئەو فلۆرایە پیویستی بەچاوپیاخشاندنەوەو کارکردنی زانستی‌یە لەسەری بەلای کەمەوە ئەو ناوچانەی کە کوردستان دەگریتەوە چونکە هەندیك ناوچە کە جۆریك لەرووەکی لییە ناوی نەهاتووەو ئەمە جگە لەوەی لەوانەیە زۆریك لەرووەك لە کوردستاندا هەبیت و لەم فلۆرایەدا تۆمار نەکرابیت و ئەم کارەش لەریگای تویژینەوەی زانستی بەردەوام لەسەر ناوچە جیاجیاکانی کوردستان تەواو دەبیت، چونکە بەراستی پرۆژەیەکی بەم جۆرە

پێویستی بە کۆمەڵەیەکی گەورەیە کاری بۆ بکات لە کاتێکدا کە تاکو ئێستا پۆلێنکردنی رووەك نەبۆتە پرۆژەیەك کاری زانستی لەسەر ئەنجامبدرێت و هەنگاوی پراکتیکی لەم رووەو زۆر دەگمەنەو تەنها لەچەند ماستەرنامەیەکدا خۆی دەبینێتەوە. لێرەداو لەم بابەتەدا بەپێی تواناو ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستمدا بوون (بەتایبەتی بەشەکانی فلۆرای عێراق) هەربەو مەبەستەو وەك هەنگاوێکی سەرەتایی زۆربەی دارو درەختەکانی کوردستانم خستۆتە روو، گەڕاندومەتەوە بۆ خێزانەکانیان و لەهەندێك شوێنیشدا بایەخی دارەکە یان درەختەکەم باسکردووە، بەڵام زیاتر گرنگی دراوە بە دارەکانی میوە کە بە کۆڵەیەکی سەرەکی لە کۆڵەکەکانی ئابوری زۆربەی وڵاتانی جیهان دادەنرێت و سەرەڕای خواردنی بەتەڕی و تازەیی لە چەندەها پیشەسازی خۆراکیدا بەکاردێت. هەر لەبەر ئەو هۆیەش سەرەتا باسی چۆنێتی یان رێگەکانی دابەش کردنی داری میوە دەکەین.

**دابەشکردنی دارەکانی میوە Classification of tree crop**

**زانستی چاندنی میوە** (pomology ( Fruitcrop یەکێکە لە لقە سەرەکییەکانی زانستی باخداری Horticulture ئەم زانستە بایەخ بە خوێندن و لێکۆڵینەوەی بەروبومەکانی میوە دەدات کە خاوەن بەهایەکی ئابوری و خۆراکی و کشتوکاڵی بەرزە بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوەش سەبارەت بەم زانستە چەند جۆرێك دابەشکردن و بۆ میوەهات دانراوە بەپێی فاکتەرەکانی کاردەکاتە سەر گەشەو دابەشکردنی و بڵاوبونەوەی جوگرافی و ئامانج لە چاندنی، گرنگترین ئەم رێگایانەش ئەمانەن:

**یەکەم/ دابەشکردن بە پێی بایەخی ئابوری:**

چاندنی کۆمەڵێك میوە دەگرێتەوە وەك مزرەمەنییەکان، زەیتون، سێوو جۆرەکانی سەربەهەمان خێزان، ترێ، میوەی ناوك بەردینەکان و گوێزو بادەم، ...هتد).

**دووەم/ دابەشکردنی باخداری Horticultural plant class**

ئەم جۆرە دابەشکردنە پشت بەچەند لایەنێك دەبەستێت وەك بوونی رێژەی ئاو و پلەی توندوتۆڵی و تامەکەی و زوو تێکچوون و خراپبونی لەدوای چنینەوەی یان لەسەر بناغەی پێکهاتەی میوەکەو گرنگترین شێوازەکانیشی ئەمانەن:

أ-بەپێی سوڕی ژیانی: زۆربەی رووەکەکانی میوەهات سوڕی ژیانیان لەدوو ساڵ زیاترە (perennial plants).

ب-بەپێی سروشتی گەشەی گەڵاڵەکان و مانەوەی لە سەردارەکان ئەمانەش لەجۆری ئەو دارانەن کە هەمیشە گەڵاکانیان سەوز fruit plant Evergreen وەك مزرەمەنییەکان و زەیتون و یەنگی دونیا.. هتد یان لە جۆری ئەو دارانەن کە گەڵاکانیان لە وەرزی زستاندا دەوەرێن وەك سێو و مێوەو گوێزو هەنار و ...هتد.

**سێیەم/ دابەشکردنی ئاووهەوایی Climatic classification**

ئەم جۆرە دابەشکردنە پشت دەبەستێت بە دابەشکردنی جوگرافی لەسەر گۆی زەوی و گرنگترین بەشەکانیشی ئەمانەن:

أ-میوەهاتی ناوچە ساردەکان Cold zone fruit (وەك سێو و قۆخ و هەڵوژە).

ب-میوەهاتی ناوچە مامناوەندەکان Tempratezone fruit (وەك هەرمێ و گوێزو زەیتون و قەیسی و بادەم و بەهێ و یەنگی دونیا).

ج-میوەهاتی ناوچە ئیستوائییەکان Tropical zone fruit (وەك هەنجیر، هەنار، مزرەمەنی).

چوارەم/ دابەشکردنی بەپێی مورتنسن و بولارد Mortensen and Bullard

**بەروبوومەکانی میوە بۆ چوار کۆمەڵی گەورە دابەشکراوە بە پشتبەستن بە پلەی بەکارهێنان و بایەخیان:**

أ-ئەو بەروبومانەی کە خاوەن بەهایەکی ئابوری بەرزن.

ب-ئەو بەروبومانەی کەخاوەن بەهایەکی ئابوری سنوردارن.

ج-ئەو بەروبومانەی کە تەنها بۆ بازاڕ دەڕوێنرێن.

د-ئەو بەروبومانەی کە بەهای ئابوورییان زۆر نزمەو ناخرێنە بازاڕەوە لەپێش ئەو خستنەڕووی نمونە رووەکییەکان بەپێویستی دەزانم خوێنەر ئاگاداری ئەو خاڵە بکەمەوە کە لەم بابەتەدا تەنها دارو درەختی میوە یان ئەو دارانەی کە لە رووی ئابوورییەوە بایەخییان هەیە باسنەکراوە بەڵکو زۆرێك لەدارو درەختی دیکەش ناویان هێنراوە کە لە کوردستان دەگمەنن یان نەناسراون یان بایەخی ئەوتۆیان نییە، هەروەها ئەو دارو درەختانەی لەم بابەتەدا ناویان هاتووە بەدڵنیایی هەموو دارو درەختی کوردستان نییە بەڵام دەتوانم بڵێم بەشی هەرە زۆری دارو درەختەکانی میوەیە.

**Plant Kingdom**
**Divison: Spermaphyta**
**Subdivision: Gymnospermae (1)** تۆو ڕوتەکان
**Order: Coniferales**
**Family: Cupressaceae**

درەخت یان دارن، گۆیکەکانی ڕوتن گەڵاکانیان هەمیشە سەوزن بەشێوەی بازنەیی (٣-٤) گەڵایان بەرامبەر یەك ریزبوون، شێوەیان دەرزیلەیی Acicular یان شمشێرییە Lanceolate، گوڵەکانی تاك ماڵەن monocious، (واتا گوڵی تێرەو گوڵی مێیە لەسەریەك دارە) یان جوت ماڵەن dioecious (واتا گوڵی نێرە لەسەردارێکەو مێیە لەسەر دارێکی دیکەیە)، ئەم خێزانە نزیکەی ١٦ توخم (genus-genera)و ١٣٠ جۆر seecies دەگرێتەوە. نمونە وەك *Juniperus* کە دوو جۆری هەیە (*J.polycarpas*) کە بڵاوبونەوەی سنوردارە بەڵام (*J.oxycedrus*) لەڕووی ئابورییەوە سودی هەیە، دارەکەی بۆ سوتان و بەکاردەهێنرێت و

جۆرە زەیتێکی تایبەتیشی لێ دەردەهێنرێت، هەندێك جاریش مادە بۆنخۆشەکانی بۆ تامو بۆی خۆراك لێدروستدەکرێت.

**بڵاوبوونەوەی DISTRIB**

ناوچەی ئامێدی- زاخۆ، حەریر،زاویتە، سەرسەنگ، شارانیش، خانچە، گوندی تۆویت.

ناوە باوەکەی لەدهۆك پێی دەڵێن (هاڤرست یان هڤریژك) یان عەرعەر. توخمێکی دیکەی هەیە بەناوی (*Cupressus*) لە کوردستان تۆمار نەکراوە، بەڵام توخمی سێهەمیان (*Thuga orientalis*) ە لەناوچەی سلێمانی- بەکرەجۆ هەیە.

**خێزانی سنەوبەرییەکان Family: Pinaceae**

بە زۆری دارن Trees و کەمیان درەختن Shrubs و هەمیشە سەوزن evergreen ئەم خێزانە ٩ توخمو ٢٠٠ جۆری لە خۆی گرتووەو بڵاوبوونەوەی بەر فراوانە.

نمونە وەك کاژ یان سنەوبەر pinus لەناوچەی سلێمانی- بەکرەجۆ- ئامێدی- زاویتە، ئەتروش.

**Subdivision: Angiospermae (2) تۆو داپۆشراوەکان**

**Class: Dicotyledones دوو لەپەکان**

**Sub class: Lignosae**

**order: Rosales**

**خێزانی رۆزاسییە Family: Rosaceae**

دار یان درەختن گەڵاکانیان بەزۆری تاکو لۆیە Alternate phyllotaxy، سادەن Simple یان ئاوێتەن Compound کونچکەڵەیان هەیە stipules گوڵەکانی بە زۆری لە جۆری تیشك هاوتان symetry actinomorphic ، جوت توخمن Bisexual بە دەگمەنیش تاك توخمن Unisexual، نزیکەی ١٤٠ توخم لە خۆی دەگرێتو دابەش بونێکی کوسمۆ پۆلیتی هەیە، لەڕوی ئابورییەوە بایەخێکی گەورەیان هەیە چونکە خاوەنی بەهایەکی بەرزی خۆراکینو زۆریان میوەنو پێکهاتەی خۆراکی جۆربەجۆریان تیادایە.

**لەو جۆرە بڵاوانەی لە کوردستان هەیە:**

**1-*Cotoneaster racemi florus* کاکیف**

درەخت یان داری پچوکە ناوەکەی لەناوچەی سلێمانی (کیلۆف) یان (کاکیف)ی پێ دەڵێنو لە زاویتە پێی دەڵێن (گیز بلوك)، لەڕووەکە پزیشکییەکانەو لە دروستکردنی دەرماندا بەکاردەهێنرێت، لە کشمیر بۆ ئازاری گەدە بەکاردێت.

**بڵاوبوونەوەی :**

ناوچەی ئامێدی- ئاردین، سەرسەنگ، زاویتە، شارانیش، لەناوچەی سلێمانیش - پیرەمەگرون، پێنجوێن هەیە.

**2- Quince بەهێ**

ناوە زانستیەکەی Cydonia ablonga ، گوڵێکی گەورەی پەمەیی لە بەهاردا هەیەو لە کۆتایی هاویندا دەبێتە بەرێکی ڕەنگ ئاڵتونی جوان، تامو بۆیەکی تایبەتی هەیەو لە زۆر وڵاتان لەبەر ئەو تامو بۆخۆشەی دەکرێتە ناو خواردنەوەو دەنکەکانی بەوە جیادەکرێتەوە زۆر لینجەو لە هەندێك ناوچەدا بۆ چارەسەرکردنی کۆکە بەکار دەهێنرێت.

سنوری بڵاوبوونەوەی بەرفراوان نییەو وامەزەندە دەکرێت تەنها لەناوچەی سلێمانی- قەرەداخ هەبێت، بەڵام لە (سنکێ) یش هەیە.

**3-*Pyrus communis* هەرمێ**

بڵاوبوونەوەی زۆر کەمە لە فلۆرادا تەنها (سەری حەسەن بەگ لەناوچەی ڕەواندز تۆمار کراوە بەڵام لەشوێنی دیکەش هەیە.

**4-*Pyous syriaca* کاورۆ**

لە ناوچەی سلێمانی پێی دەڵێن کاورۆ (Kawro)

بڵاوبوونەوەی:

ناوچەی سلێمانی / قەرەچەتان، پیرەمەگرون، پێنجوێن.

ناوچەی ڕەواندز/ سەفین، ڕەواندز، هەندرێن، رایات.

ناوچەی ئامێدی/ ماریەعقوب، خانچە.

5-*Pyrus malus*سيو

له‌ هه‌نديك ناوچه‌ی كوردستان چينراوه‌.

6-*Sorbus umbellata*

له‌ چه‌ند ناوچه‌يه‌ك هه‌يه‌ وه‌ك:

زاخۆ، زاويته‌، سه‌رسه‌نگ، گوندی سيڤارا، كارۆخ.

7-*Eriobotrya japonice*يه‌نگی دونيا

له‌ فلۆرادا تۆمارنه‌كراوه‌ له‌ كوردستاندا هه‌بيت به‌لام‌ به‌دلنياييه‌وه‌ له‌ كوردستان هه‌يه‌ (نمونه‌ له‌ سليمانی).

8-*Amelanchier integrifolia*به‌شمه‌له‌

رووه‌كيكی پزيشكييه‌، بلاوبوونه‌وه‌ی سنورداره‌ ته‌نها له‌ قه‌ره‌داغ و ئاميدی هه‌يه‌.

9-*Crataegus*گۆيژ

گۆيژ بلاوبونه‌وه‌ی فراوانه‌و چوار جۆری هه‌يه‌ كه‌ ئه‌مانه‌ن

*C. azarolus*

له‌ سنجارو زاويته‌و ئاميدی و سه‌فين و هه‌ندرين و شاخی سه‌فين و سليمانی و پينجوين و قه‌ره‌داغ و سه‌رچنار هه‌يه‌.

*C.pentagyna*

زۆر ده‌گمه‌نه‌و ته‌نها له‌ قه‌ره‌داخ هه‌يه‌.

*C.monogyna*

له‌ شيخ هادی، ئاكرێ، ره‌واندز، شه‌قلاوه‌، قه‌ره‌داخ، پينجوين هه‌يه‌.

*C.meyeri*

له‌ ئاميدی- دهۆك، ره‌واندز-چۆمان، سليمانی-قه‌ره‌داخ، سه‌رچنار، هه‌يه‌.

**Rubus**تو‌ترك

**1-Rubus caesius**چه‌ند جۆريكی هه‌يه‌ وه‌ك:

بلاوبونه‌وه‌ی كه‌مه‌ له‌م شوينانه‌ هه‌يه‌:

سه‌رسه‌نگ و نزيك رانيه‌و پينجوين.

**2- Rubus sanctus**

له‌ ماريه‌عقوب- سميل، زاويته‌، ئاكرێ، ئاميدی، ره‌ندوز، چۆمان سليمانی- سه‌رچنار، پينجوين، ته‌ويله‌ هه‌يه‌.

**Potentilla reptans** كه‌نيره‌

له‌ناوی سليمانی پيی ده‌لين كه‌نيره‌، گوليكی زه‌ردی مه‌يله‌و پرته‌قالی هه‌يه‌و زۆر به‌خيرايی بلاوده‌بيته‌وه‌ به‌شيوه‌يه‌ك ناتوانريت كۆنترۆل بكريت، روه‌كيكی پزيشكيه‌، ٢-٥٪ی خه‌ستكراوه‌ی ره‌گه‌كه‌ی (يان گه‌لاكانی) به‌كارديت بۆ چاره‌سه‌ركردنی قه‌بزی و

گرفته‌كانی ديله‌ی ريخۆله‌ له‌ كه‌سانی به‌ته‌مه‌نداو به‌ ژماره‌ی گه‌لاچكۆكه‌ (**leaflet**) ه‌ كانی جياده‌كريته‌وه‌ كه‌ ژماره‌يان پينجه‌.

**پينج جۆری ديكه‌ی هه‌يه‌:**

***P.pannosa , P.supina , P. hirta , P.speciosa , P.kurdica***

ئه‌مه‌ی دواييان يه‌كه‌مجار له‌ كوردستان تۆماركراوه‌و له‌ ته‌نيشتييه‌وه‌ ناوی ئيسماعيل سه‌رهه‌نگ نوسراوه‌و له‌م ناوچانه‌ هه‌يه‌:

**قه‌ره‌داخ قۆپی قه‌ره‌داخ، هه‌لگورد.**

***Prunus***

گه‌لاكانی ده‌وه‌رين **Deciduous**يان هه‌ميشه‌ سه‌وزن، دارن يان دره‌ختن ١٣ جۆری هه‌يه‌ ليره‌دا گرنگترينيان باس ده‌كه‌ين:

1-*Prunu cerasifera*هه‌لوژه‌

له‌ فلۆرادا تۆمار نه‌كراوه‌ به‌لام له‌م ناوچانه‌ی كوردستان هه‌يه‌: خه‌مزه‌، سيته‌ك، قه‌مچوغه‌، كه‌ناروێ، چنگيان.

2-*P.domestica*جۆريكی ديكه‌ی هه‌لوژه‌

3-*P. armeniaca*قه‌يسی

4-*P.amygdalus*(چواله‌) باده‌م

له‌ فلورادا بلاوبونه‌وه‌ی باده‌م ته‌نها ئه‌م شوينانه‌ تۆماركراوه‌:

زاويته‌، ئه‌تروش، سه‌فين، شه‌قلاوه‌، ده‌ربه‌نديخان، به‌لام له‌ ناوچه‌ی ديكه‌ش هه‌يه‌ وه‌ك قه‌مجوغه‌ (خه‌تی دوكان).

5-*P. persica* قۆخ

6-*p.arabica*ئه‌م جۆره‌يان له‌ هه‌نديك ناوچه‌ی كوردستان پيی ده‌لين چاقوله‌ (*Chaqala*) له‌ دهۆك (زاوييته‌) پيی ده‌لين شيفتك (**Shiffink**) هه‌رچه‌نده‌ بلاوبونه‌وه‌ی به‌رفراوانه‌ به‌لام له‌ كوردستان ناسراو نييه‌و بايه‌خيكی ئه‌وتۆی پينه‌دراوه‌ له‌گه‌ل ئه‌وه‌شدا كه‌ ديمه‌نيكی جوانی هه‌يه‌و ده‌شيت له‌ باخچه‌كاندا بروينريت.

ئه‌و ناوچانه‌ی ئه‌م جۆره‌ی شه‌شه‌ميانی لييه‌ وه‌ك: شه‌قلاوه‌، حه‌رير، چناروك، قه‌ره‌داخ، ته‌ويله‌، كانی دومه‌لان، شاخی حه‌مرين، مه‌نده‌لی...

7-*P.mahaleb* گيلاسه‌

بلاوبونه‌وه‌ی: شاخی سنجار، سه‌نگه‌سه‌ر، قه‌ره‌داخ، هه‌ندرين، پيره‌مه‌گرون، قه‌ره‌چه‌تان.

پاقلەییەکان Order: Leguminales

خیزانی سمیلی پاشا Family: Caesalpinjaceae

بۆیە ناونراوە سمیلی پاشا بەزۆری ئەندامی نێرەکی گوڵەکانی زۆر درێژن و لە گوڵەکە هاتونەتە دەرەوەو شێوەی سمیلیان وەرگرتووە، بە زۆری دارو درەختن و دەگمەن گژوگیا بن، گەڵاکانی ئاویتەی شێوەپەری Pinnate یان جووت پەڕین Bipinnate بەدەگمەن سادە یان جۆری تاك گەڵاچکۆکە Uni Poliolate بن ئەم خێزانە نزیکەی ١٥٠ توخم (genera)و ٢٨٠٠ جۆر (species) دەبێت.

**هەندێك لە جۆرە باوەکان:**

***Gladitsia triacanthos***

گەڵایەکی وردی ئاویتەیی هەیە، لقەکانی درکاوییە بەزۆری لەسەر شەقامەکان و باخچە گشتییەکاندا دەروێنرێت، لە فلۆرادا تەنها سەرچنار تۆمارکراوە بەڵام لە راستیدا لەزۆر شوێنی دیکەش روێنراوە.

***Cassia* کاسیا**

چەند جۆرێکی هەیە بەڵام لە کوردستان تەنها یەك جۆریان C. obtusifolia لەشاخی حەمرین تۆمارکراوە.

***Cercis siliquastrum ئەرخەوان***

دارێکی ناسراوە \او گوڵیکی پەمەیی زۆر جوانی هەیە لەزۆر شوێن و روێنراوەو بەرەکەی بەدارەکەوە دەمێنێتەوە، بەڵام لە فلۆرادا تەنها ئەم شوێنانە تۆمارکراوە: زاویتە، خانزاد، چالی کەسك.

**خیزانی Family: Mimosaceae میمۆساسییە**

درەخت یان دارن، گەڵاکانی لە جۆری جووت پەڕین Bipinnate لە زۆری گوڵەکان جووت ماڵەکان Bisexual، پەرەکە رەنگاو رەنگەکانی لە جۆری تیشك هاوتان actinoumorphic symetry، (٣-٦) پەرەکەیان هەیە دانیشتوون Sessile یان لاسکۆکە Petiol یەکی کورتییان هەیەو گوڵەکانیشی زۆر بچوکن، ئەم خێزانە نزیکەی ٥٦ توخم (genera)و ٣٠٠٠ جۆر (species) ی لە خۆی گرتووە لەو جۆرانەی لە کوردستان هەیە:

***Prosopis farcta ئەستەری***

**ئەستەری یان خەرنوك لەم ناوچانە بڵاوە:**

زاخۆ، ئەتروش، نیوان حەریرو بابە شێخان، رەواندز، قەرەداخ، هەولێر، ئالتون کۆپری، کەرکوك، جەلەولا، خانەقین، خالس، فەلوجە.

Family: Papilionaceaeخیزانی پەپولەییەکان :

درەخت یان دارن، گەڵاکانی سادەن یان ئاویتەن، پەڕین یان لە جۆری ئاویتەی سێ گەڵاچکۆکە Trifoliolateن گوڵەکان لە جۆری تەنیشت هاوتان Zygomorphic ئەم خێزانە یەکێکە لە خێزانە گەورەکانی رووەکە گوڵدارەکان، (٥٠٠-٤٥٠) توخم و ١٢,٠٠٠جۆر لەخۆ دەگرێت.

**جۆرەکانی زۆرن لێرەدا چەند نمونەیەك باسدەکەین:**

**1-*Anagyris foetido* قەرەتاج**

قەرەتاج یاخود کەرات لەم شوێنانە هەیە: گوندی ساپانا لە دهۆك، زاویتە، شاخی سەفین، سلێمانی، بەرانان، کەرکوك.

**2-*Argyrolobium crotalarioides***

ناوچەی ئامێدی-ماریەعقوب نزیك سمێڵ، زاویتە نزیك دهۆك.

**3-*Spartium Junceum***

لە سەرسەنگ هەیە.

**4-*Gehista tinctoria***

لە شەقلاوە هەیە.

**5-*Ononis spinosa* پە نجە شەیتان**

پەنجە شەیتان یاخود شێریش بڵاوبوونەوەی لە جۆرەکانی دیکە فراوانترە ئامێدی-ئاردین، سەری ئامێدی، سولاف، سەرسەنگ، ئەتروش ناوچەی رەواندز- شەقلاوە، حاجی هۆمەران، چیای ماندۆ نزیك وەلاش ناوچەی سلێمانی- کانی سپیکە، پێنجوین، هەورامان.

لە هەندێك ناوچەدا رەگەکەی وشك دەکرێتەوەو لەکاتی پێویستیدا لەگەڵ ئاو یان سرکە تێکەڵ دەکرێت بۆ چارەسەرکردنی ئازاری دان.

**6-*Ononis mitissima***

نزیك ئاکرێ و نزیك مێرگە سورو سلێمانی هەیە.

**Order: Araliales**

**خیزانی کۆناسییە Family: Cornaceae**

ئەم خێزانە نزیکەی ١٥ توخم و ١٠٠ جۆرە بەزۆری دارن یان درەختن ریزبوونی گەڵاکان لە جۆری opposit phyllotaxy یان تاك و لۆن Alternate سادەن و گوێچکەلەیان نییە گوڵەکانی لە

جۆری تیشك هاوتان actinomorphic تەنها یەك توخمیان لە کوردستان هەیە ئەویش Cornus australis لە کوردستان پێی دەڵێن دارەقرە لە ناوچەکانی ئامێدیو ماتێناو سەرسەنگو برادۆستو نێوان کەرکوکو دەرگەڵەو هەورامان تەوێڵەو پێنجوێن هەیە.

**Family: Araliaceae خێزانی ئاریلاسییە**

دار یان درەختن، گەڵاکانی سادە یان ئاوێتەنو گوێژکەڵەیان هەیە ریزبونیان بە زۆری بەشێوەی تاكو لۆیە بە دەگمەن بەرامبەر یەکن گوڵەکانی هێشودارن (یان لەشێوەی هێشودان) نزیکەی ٥٥ توخم (genela)ی هەیە، بڵاوبوونەوەیان لە کوردستان سنوردارە بایەخی ئابورییان نییە. ئەو توخمەیان کە زۆر بڵاوە درەختی هایدرایە (Hedera helix) ە لە ئامێدیو سەرسەنگو زەڵمو تەوێڵە تۆمارکراوە.

**Family : Coprifoliaceae خێزانی کاپریفۆلیەسییە**

ئەم خێزانە بڵاوبوونەوەی لە کوردستان سنوردارە نزیکەی ١٢ توخمو ٤٥٠ جۆری هەیە تەنها بەیلەسان (Sambucus ebulus) لەم ناوچانەدا بڵاوبۆتەوە:

سلێمانی، پیرەمەگرون، ڕەواندز

هەروەها جۆرێکی دیکە شۆنگ (شین) یان گوڵە هەنگوین Lonicera orborea لەم ناوچانەدا هەیە:

شاخی سنجار، زاوێتە، زاخۆ، ماتێنا، ئامێدی، قەرەداخ، سەرسەنگ، هەندرێن، نێوان ئاریو زیراوا، پیرەمەگرون، زیوێ، پێنجوێن، نێوان هەڵەبجەو تەوێڵە، خانچە.

**Platanaceae family خێزانی پلاتاناسییە**

ڕووەکەکانی دارنو گەڵاکانی شێوە دەستی پلدارن palmetly lobed، تاكو لۆ ڕیزبوونو قەدەکەی تەڵاشی هەڵوەریوی هەیە، گۆیکەی بنو هەنگڵو گوێچکەڵەی گەورەیان هەیە. ئەم خێزانە تەنها یەك توخمی لەخۆی گرتووە کە ٦-٧ جۆری هەیە.

**Platarus orientalis چنار**

لەشێخ هادی، سەرسەنگ، زاوێتە، ئامێدی، ئاردین، حاجی هۆمەران، ڕەواندز، شەقڵاوە، سلێمانی، ڕانیە، کانی سپیکە، سەرچنار هەیە. بەڵام لە ناوچەی دیکە هەیە نمونە وەك تەوێڵە:

**خێزانی سالیکاسیا Salicaceae Family**

دارن یان درەختن، دارەکانیان سپیو سافنو ٣-٤ توخمیان هەیە لەگەڵ ٥٠٠ جۆر، بڵاوبونەوەیان بەرفراوانە.

***Populus euphratica* سپیدار**

دارەکەی بۆ دروستکردنی زۆر کەلو پەل بەکاردێت وەك دروستکردنی بەلەم بەڵام بۆ سوتاندن باش نییە، گەڵاکانی خۆراکێکی باشە بۆ مەڕوماڵات.

بڵاوبونەوەی:

ئامێدی، سەرسەنگ، جوندیان، ڕەواندز، قەرەداخ، خانەقین، مەندەلی، شانیدەر.

**ئەسپینداری ڕەش P. nigra**

لە نزیك ئاوەوە دەڕوێنرێت زۆرخێرا زیاد دەکەن دارەکەی بۆ زۆر مەبەست بەکاردێت لەوانە دروستکردنی خانوو،

بڵاوبوونەوەی:

قەرەهەنجیر، بەکرەجۆ، چۆمان.

**ئەسپینداری سپی P. alba**

چاندنی لە کوردستاندا باشە بەڵام لە بەشی خوارووی عێراقدا چاندنی سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، لە کۆڵەکەی خانوو دروستکردنو سەوڵی بەلەم بەکاردێت.

بڵاوبوونەوەی :

سەندور، دهۆك، چیای مەنداو.

نمونەیەکی دیکەی بڵاوی خێزانی سالیکاسیا (بی)یە Salix چەند جۆرێکی هەیە وەك:

***Salix babylonica* شۆڕەبی**

لە سلێمانیو شەقڵاوە هەیە.

***Salix acmophlla***

لە شاخی سنجار ئاکرێ، سەرسەنگ، ئامێدی، سەرچنار، قەرەهەنجیر، چنارۆك هەیە.

بڵاوبوونەوەی :

***Salix alba* بی سپی**

لە دەربەندی بازیان و دهۆكو سەرسەنگ و سلیمانیو قەرەداخو شاخی حەمرین هەیە.

***Salix aegyp+iaca***

لە ئامیدی، سۆلاف، چۆمان، سەرسەنگ، نیوان ئاری و زیراوا هەیە.

**Order: fagales**

***family: Betalaceae* خیزانی بیولاسییە**

دوو توخمی هەیە یەکیکیان Betula Pendula ناوەباوەکەی (سندەر) یان (غوش)ە و (تامول) یشی پیدەلین.

تەنها لە نیوان ئاری و زیراوا هەیە.

**fagaceae family فاگاسییە**

٦توخمەو زیاتر لە ٨٠٠ جۆری هەیە، بەروو باوترین جۆری ئەم خیزانەیە.

***بەروو Quercus aegilops***

لەشاخی سنجار، ئامیدی، چۆمان، سوارە توكە، زاویتە، ئاكرێ كانیسپیكە، پینجوین، هەلەبجە، نیوان هەولیرو رەواندز، سەلاحەدین گەلی عەلی بەگ، دیانا، رەواندن، قەرەداخ، جافەران، سلیمانیو قەرەچەتان، كۆرەگ هەیە.

***بەروو Q.macranthera***

ئەم جۆرە زۆر دەگمەنە لەكوردستان تەنها داریك لەناوچەی رەواندز سەری حەسەن بەگ هەیە تەمەنی ٤٥ساڵ دەبیت.

**Q.aegilops**
**Subsp. brantii**

لەم شوینانەدا زۆر بلاوە:.

شاخی سنجار، بیستان چر، زیبار، گەلی عەلی بەگ، سوارەتوكە سەلاحەدین، رەواندز، سیتاقان، گوندی بەنتا.

**Q.aeglilops**
**Sub sp. persica**

زۆر دەگمەنەو تەنها لەم ناوچانەدا بینراوە:.

قەرەداخ، سەلاحەدین، سلیمانی.

***جۆریكی دیكەیە لەبەروو Q.libani***

كوردی ئامیدی پیی دەلین (دندار) یان (دلدار)و گەلا ولقەكانی بۆ دروستكردنی كەپری هاوینەی باخەكانیان بەكاریدەهینن و بەرەكەشی بۆ خواردن.

لەم ناوچانەش بلاوبۆتەوە:. سەری ئامیدی، بیستان چر، سوارەتوكە ئەسپینداری نزیك سوارەتوكە، سەرسەنگ، قەرەداخ، سەفین، سەری حەسەن بەگ، نیوان كانیرەشی سەروو، حاجی هۆمەران، خەجان.

***مازوو Quercus infectoria***

لەم ناوچانەدا بلاوبۆتەوە:.

زاخۆ، سەرسەنگ، ساپانا نیوان ئامیدیو زاخۆ، كازاركی، زاویتە سوارەتوكە، پیرمام، سەلاحەدین ، كانی وەتمان، بابەشیخان، گەلی عەلی بەگ، رەواندز، دیانا، سیتاقان، سلیمانی، قەرەداخ، پینجوین، جافەران.

**كۆریلاسییە Corylaceae Family**

دار یان درەختن، گولەكانی تاك مالەن و لەشیوەی هیشوودان، هیشووی مییەك بەجیاو هیشووی نیرەك بەجیا، گەلاكانی سادەن و بەشیوەی تاكو لۆ ریز بوون، وەك:.

***بندوق Corylus avellana***

دەلین لەكوردستان هەیە، بەلام بەپیی فلۆرای عیراق هیچ زانیارییەك نییە دەربارەی تەنها لەشەقلاوە بینراوەو بەرەكەی باش نییە.

**Order:. Juglandales**
**گویزییەكان Family:. Juglandaceae**

داری گویز بایەخی گەورەی هەیە لە رووی دارو لەرووی بەریشەوە گەلای دارەكانی ئەم خیزانە لەجۆری ئاویتەی تاك لوتكەی پەرین Imparipinnate. وەك گویزJuglans regia

لەفلورای عیراقدا تەنها شەقلاوەو قەرەداخو رایات لەرەواندز تۆماركراوە بەلام لەراستیدا شوینی دیكەش لەكوردستاندا هەیە كە بەگویزی ناوپرو تویكل ناسك ناوبانگی دەركردووە وەك ناوچەی هەورامان هەروەها موسەكو سیتەكیش گویزی لییە.

**Urticales order:. خیزانی ئەلماسییە Ulma ceaefamily وەك:.**

دردار Ulmase densa لەحاجی هۆمەران هەیەو جۆریكی دیكەی هەیە بەناوی u. androssowii ئەم جۆرە زۆر دەگمەنەو ئیسماعیل سەرهەنگ لەگوندی (بەنتا)ی نیوان بۆلیو مالامە لەناوچەی رەواندز بینیویەتی، هەروەها دەلین لە قەرەچەتانیش هەیەو لە قەرەداخو لە پیرەمەگرونیش تەنها داریك بینراوە.

تواك *Celtis tournefortii* جۆریكی دیكەی سەربەهەمان خیزانی پیشووە بەرەكەی زۆر بچوكەو گۆشتیەو تامی شیرینە لەناوچەی ئامیدیو سەرسەنگو قەرەداخو حەریر هەیە.

**خیزانی توو Moraceae**

دار یان درەختی هەمیشە سەوز یان گەلا وەریون، گەلاكان لەجۆری سادەن یان پلداری شیوە دەستین، تاكو لۆ ریزبون، بەزۆری جوت مالەن نزیكەی ٧٠توخمو زیاتر لە١٨٠٠ جۆری هەیە، وەك تووی سپی *Morus alba* بلاوبونەوەی بەرفراوانە هەندیك لەو شوینانەی لەفلورادا ناویان هاتووە، شەقلاوە، قەرەداخ، رەواندز، سەرچنار، ئاسكی كەلەك، جۆریكی دیكەی تووی سور (یان رەش یان شاتوو)ە *Morus nigra* لەشەقلاوەو قەرەداخو هەلەبجەو دیی ئەحمەد ئاوا تۆمار كراوە، بەلام لەزۆر شوینی دیكەش هەیە. هەنجیر Ficus جۆریكی دیكەی هەمان خیزانی تووە لەكوردستان تەنها یەك جۆری كیوی *Ficus carica* كە دوو Variety هەیە، یەكیكیان (*Var. carica*)یە لەحەریرو رەواندزو بیخالو جەلالە هەیە ئەوی دیكەشیان ناوی (Var. rupestris)ە لەزاخۆ و زاویتەو سەفینو شەقلاوەو دەربەندیخانو بازیانو پینجوین هەیە. بەلام جۆرە چینراوەكانی (٧) جۆرە گرنگترینیان هەنجیری پیرۆز یان هەنجیری عەجەمە *Ficus religiosa*و مەطاطە *Ficus elastica* كە بۆ مەبەستی جوانكاری لەباخچەكاندا دەروینرینو شیرە رووەكییەكەشی (LateX) لاستیكی لیدەردەهینریت.

جگە لەو شوینانەی لەفلۆرادا ناویان هاتووە لەزۆر جیگەی دیكەش لەكوردستاندا هەنجیر هەیە وەك:. خەمزە، سیتەك،

قەمچوغە، تەویلە، سورداش، کەلەکن، چەرمەگا (پیرەمەگرون) کەناروێ..هتد. ئەم خیزانە جگە لەوەی بەری دارەکانی دەخوریت، تەلاشی هەندیك لەجۆرەکانی لەپیشەسازی کاغەزو قوماشدا بەکاردەهینریت.

**خیزانی سایمەلاسییە Thymelaeaceae Family**

رووەکەکانی درەختن لەو جۆرانەی لەکوردستان هەیە (تیرۆ)یە یان شوشینك (شەقلاوە) ناوە زانستییەکەی Daphine mucronata ئاژەڵ نایخوات چونکە ژەهراوییە.

**خیزانی هەنارییەکان Punicacaeae**

داری بچوك یان درەختن لقی زۆریان لیدەبیتەوە گەلاکانی سادەن، گویچکەلەیان نییە، کەولەکانی لەجۆری ئیشك هاوتان، تاك تاك یان بەشیوەی هیشوون لەکۆتایی لقەکان یان لقەکانی تەنیشت هەلگیراون، نمونەکانی وەك هەنار panica کە گەلاکاسەکەی رەنگدارە calgx petaloid و هیلکەدان لەجۆری نزمە inferior ovary، ئەو جۆرەی لەفلۆرادا هاتووە کە لەکوردستان هەیە punica granatum کە لەناوچەکانی سەرسەنگو تەویلەو قەندیلو تۆمارکراوە، یەك Var هەیە بەناوی (Var. nana) کە دارەکەی بچوکترەو بەرزی کەمترە، گەلاکانی باریكو بچوکترن و گولەکانو بەرەکەشی (واتا هەنارەکەی) هەربچوکترن، بەلام وەك هەمووماو بیستومانە هەناری شارەبان بەناوبانگە، بەلام لەفلۆرادا ناوی نەهاتووە.

**Rhamnales order:. خیزانی Rhamnaceae Family**

دار یان درەختی درکاوین، گەلاکانیان لەجۆری سادەن، بەزۆری تاكو لۆ ریزبوونو گویچکەلەیان هەیە، گولەکانی بچوكو لەجۆری تیشك هاوتان نیرومێ پیکەوەن یان بەجیان، ٦٠ تۆخمو ٩٠٠ جۆری هەیە، بلاوبونەوەی لەجیهاندا بەرفراوانە، بەلام لەکوردستاندا ئەم تۆخمانەی هەیە:.

١)درکەزی Paliurus spina-christi نزیکەی چوارمەتر دەبیت، گەلاکانی شیوە هیلکەیین، گولەکانی سەوزی مەیلەو زەردن بەرەکەی خرەو بەدەورویشتیدا پارچەیەکی زیادەی سەوزی پیوەیە لەچەتر دەچیت، لەم ناوچانەدا هەیە:. دهۆك، بیخاڵ، زاخۆ، زاویتە، سەرسەنگ، ئاکرێ، شاخی سەفین، شەقلاوە، باباشیخان، کانی وەتمان، گەلی عەلی بەگ، پردی بلکیان، حاجی هۆمەران، ئەرۆماتەی نزیك کۆیسنجق، سەرچنار، سلیمانی ریگای دوکان، قەرەداخ، هەلەبجە، سەرسیر. ئەم جۆرە بەزۆری بۆ پەرژینی باخچەو شەقامەکان دەروینریت.

٢)نەبەق (یان سەدر) Ziziphus چوار جۆری هەیە:. Z. jujuba و Z. mauritiana و Z. nummularia و Z. spina-christi بەپیی فلورای عیراق هیچ جۆریکی نەبەق لەکوردستان تۆمار نەکراوە هەبیت بەلام لەناوچەی گەرمیان هەیەو بەتایبەتی لەکەلار داریکی ناسراوە.

٣)Rtamnus cornifolius لەزاویتەو زاخۆو سەرسەنگو قەرەداخو رانییەو پیرەمەگرونو دەربەندیخانو هەورامان هەیە.

٤)Frangula aluus زۆر دەگمەنە لەکوردستانو تەنها لەگەلی عەلی بەگ تۆمار کراوە.

**خیزانی میوییەکان Vitaceae Family** یان خیزانی ترێ، ئەم خیزانە لە١١تۆخمو نزیکەی ٧٠٠جۆر پیکهاتووە تەنها یەك تۆخمی لەکوردستان باوە ئەویش ترییە vitis کە چەند جۆریکی هەیە، ترێ لەکوردستاندا بلاوبوونەوەی بەرفراوانەو رواندنی سەرکەوتن بەدەست دەهینیت. لەو جۆرە تریيانەی لەفلۆرادا ناویان لەکوردستان تۆمارکراوە ئەمانەیە:.

Vitis sylvestris لەرانیەو سەرچنارو زاویتەو سەرسەنگو چەند شوینیکی دیکە هەیە. جۆرەکەی دیکەیان V. hissarica کە subspیکی هەیە بەناوی rechingeri لەزاخۆ و هەلگوردو تەویلەو هەلەبجەو بەلکە بلاوە. ئەم ناوچانەی دیکەش لەکوردستان تریی باشیان هەیە وەك خەمزەو سیتەك، خەلەکان، کانیوەتمان، تابین، تیمار، قەمجوغە، سورداش، کەناروێ.

**Ebenaceae ، خیزانی ئیبیناسییە Ebenales order:.**
Diospyros Kaki نموونە لەسەر ئەم خیزانە کاکییە family لەفلورادا تۆمار نەکراوە لەکوردستان هەبیت، بەلام لەبیارە داریکی لیيە بەرەکەی زۆر لەکاکی دەچیتو رەنگەکەشی، لەزاری خەلکی ناوچەکەوە دەلین کاتی خۆی شیخ عوسمانی بیارە لەتورکیاوە هیناویتی، بەلام بەداخەوە لەم کاتەدا نموونەی دەست نەکەوت

تاكو دلنیابین ئەو دارە كاكییە یان سەر بەهەمان توخمی كاكییەو جۆریكی دیكەیە لەكاكی.

**Rutaceae: خیزانی مزرەمەنییەكان order:. sapindales family**

مرۆڤ لەسەردەمە دیرینەكانەوە بەتامی خۆش‌و مزری ئەم خیزانە ئاشنا بووە هەر لەبەرئەوە بایەخی بەرواندنی داوە، نیشتمانی بنەچەیی مزرەمەنییەكان باشوری خۆرهەلاتی ئاسیایەو بەتایبەتی هند كە بەوە دەناسریت تاكو ئیستا دارە مزرەمەنییە كیوییەكانی هەر لیماوە. ئەم خیزانە دوو Sub family هەیە كە یەكیكیان (ئۆرانیتودییە) یە كەتوخمی cil-rus سەر بەم (Sub family) یانەو ئەمیش چەند جۆریكە:.

١)ترنج Citrus medica:. لەكۆندا بە(سیوی میریا) ناسراوە چونكە لەناوچەی (میریا)ی ئیران هەبووە. خزمایەتییەكی زۆر لەنیوان ترنج و لیمۆدا هەیە، ترنج پیویستی بەخاكیكی قولی بەپیت هەیە ئەگەر بارودۆخی بۆ رەخساوبیت هەر داریك سالانە نزیكەی ٤٥كیلۆ دەدات زۆر جار ترنج وەك بنەچە بەكاردیت‌و جۆرەكانی دیكەی لەسەر موتوربە دەكریت. بەلام خراپی ئەم جۆرە موتوربەیە لەوەدایە كاتیك داری ترنجە كە گەورە دەبیت رەگەكانی لاوازدەبیت‌و بەرەكەشی خراپ دەبیت، بەهۆی پیداویستی گەرماوە (واتا پلەی گەرمی) ئەم جۆرە مزرەمەنییە لەكوردستان نییە.

٢)لیمۆی ترش (یان مسكی) C. limon:. خیراترین داری مزرەمەنییە لەگەشەكردندا، تۆوەكەی توانایەكی گەورەی هەیە بۆ چەكەرەكردن‌و پیویستیان بە(١٠-١٤) رۆژ هەیە لەپلەی گەرمی (٢٥-٣٠) پلەی سەدی تاكو چەكەرە دەكەن رەنگیان سەوزی تۆخە یان زەردە، ئەستوری‌و سافی تویكلەكەی بەپیی جۆرەكەی دەگۆریت، زۆر دەولەمەندە بەVCو لەزۆر پیشەسازیدا بەكاردەهینریت لیمۆ لەهەموو جۆرەكانی دیكەی مزرەمەنی كەمتر پیویستی بەگەرما هەیە، بەلام لەهەمان كاتدا لەهەموویان بەتەرزە هەستیارترە. لەكوردستان لەناوچەكانی هەولیردا دەروینریت.

٣)پرتەقال C. Sinesis:. داری پرتەقال داریكی گەورەیەو هەمیشە سەوزە هەندیكیان دركیان پیوەیە، گەلاكانی ساف‌و رەنگ سەوزی تۆخن، گولەكانی سپی‌و بۆندارن، نزیكەی ٢٠٠جۆری هەیە لەهەموو جیهاندا، لەدوای (٣-٤)سال لەموتوربەكردن بەردەدات‌و بەرەكەشی بۆماوەیەكی زۆر بەدارەوە دەمینیتەوە بەبی ئەوەی زیانی پیبگات. لەكوردستان لەناوچەكانی هەولیر دەروینریت‌و لەسلیمانیش بەریژەیەكی كەم هەیە، بەلام سەرما نایەلیت گەشەی باش بیت‌و بەری زۆر بدات.

٤)نارنج C.auratium دارەكانی بەهیزن‌و دركییان پیوەیە، گەلاكانی بۆنیكی تایبەتییان لیدیت، بەرەكەی رەنگی پرتەقالی تۆخە، كەمیك زبرەو بەئاسانی پاكدەكریت، زەیتیكی تایبەتی لەتویكلەكەی دەردەهینریت پییدەوتریت زەیتی نیرۆنی oil of neroni، نارنج شیوەی مەیلەو خرە كەمیك پان بۆتەوەو نرخی لەپرتەقال هەرزانترە چونكە رەگیكی تالی هەیەو وەك میوە ناخوریت، ئەمیش هەر لەناوچەكانی هەولیر دەروینریت‌و بەری باشیش دەدات جۆرەكانی دیكەی مزرەمەنیش ئەمانەیە: لیمۆی شیرین C.limetta، لیمۆی بەسرە C. aurantifolia(دەكریت بە چا یان دەكریتە خواردنەوەو زۆر هەستیارە بەرامبەر گۆرانی پلەی گەرمی‌و لەسەرانسەری عیراقیشدا بلاوبوونەوەی كەمە)، لالنگی C. dleliciosa، سندی C. grandis (زۆر هەستیارە بەگەرما لەپیش پیگەیشتندا، ئەمیش لەهەولیر هەیە).

**خیزانی میلاسییە Meliaceae Family**:. داری میلیا داریكی بەرزی جوانەو لەلای خۆمان بە بەرەكەی دەلین زەهری ماسی. گەلاكانی لەجۆری ئاویتەی دوانییە، گولەكەی لەشیوەی هیشودایەو رەنگی مۆری كالە، بەرەكە خرەو قەبارەی لە دەنكی نۆك گەورەترە.

لەفلۆرای عیراقیدا تەنها شەقلاوە تۆماركراوە، بەلام لەسلیمانیش هەیە.

خیزانی ئەناكاردیسییە **Anacardiceae family** چەند توخمیكی هەیە لەكوردستان وەك فستەق **Pistacia Vera** لەبەكرەجۆ تۆماركراوە. هەروەها داری قەزوان كە بنیشتیشی لیدروست دەكریت دوو جۆری هەیە یەكیكیانP.Khinjuk لەناوچەكانی وەك ماتینا، زاخۆ، زاویتە، سنجار، ماریەعقوب، شارانیش هەیە. ئەوی دیكەیان P.eurycarpa بلاوبوونەوەی لەو جۆرەی پیشوو فراوانترە لەسەرسەنگ‌و زاویتەو شارانیش‌و خانچەو برادۆست‌و شەقلاوەو شاخی سەفین‌و ئاكری‌و شیخ هادی لەناوچەی رەواندز هەیە هەروەها لەسەروو رانیەو شانیدەرو قەرەداخ‌و سلیمانی‌و قەرەچەتان‌و پیرەمەگرون‌و كانی‌ساردو دەربەندیخان‌و تەویلەو سەروو بیارەو پینجوین هەیە.

**خیزانی زەیتون Oleaceae family:**

توخمی باوی ئەم خیزانە زەیتونە olive ناوە زانستییەكەی Olive europaeal. نیشتمانی بنەچەیی زەیتون خۆرهەلاتی دەریای ناوەراستەو لەكوردستانیش چەند باخیكی سروشتی زەیتون لەناوچە شاخاوییەكاندا هەیە. بەرەكەی بۆ خواردن‌و دەرهینانی زەیت كەبەهایەكی گرنگی هەیەو گەلاكانی بۆ مەبەستی پزیشكی‌و بازرگانی بەكاردیت. پلەی گەرمی نمونەیی زەیتون لەنیوان (١٨-٢٠) پلەی سەدیدایە لەبەرئەوە لەكوردستان توانیویەتی خۆی بژینیت‌و بەرگەی پلەی گەرمی نزم تاكو ٧پلەی سەدی ژیر سفر دەگریت‌و پلەی گەرمی بەرزیش بەرگەی (٤٠-٥٠)پلەی سەدی دەگریت، یەكیك لەجۆرەكانی Olive europaea یە لەشەقلاوەو ئاكری‌و شیخ هادی‌و رەواندزو زۆر شوینی دیكەش تۆماركراوە، لەو جۆرە جیهانییانەی لەكوردستان دەچینریت وەك سفلانۆ، ئەسكەلانۆ، مەنزللۆ.

**سەرچاوە:**

1-Flora of Iraq, Volume one, Introduction to the flora, edited by Evan Guest with assistance from Ali-Al-Rawi,1966.

2-Flora of Iraq, Volum two, edited by C.C.Townsend and Evan Guest with the collaboration of Ali-Al-Rawi,1966.

3-Flora of Iraq, Volum three, edited by C.C.townsend and Evan Guest with the collaboration of thr Botany directorate of the ministry of Agricuture and Agrdian Reform, Baghdad,1974.

4-Flora of Iraq, Volum four (part one), edited by C.C.Townsend and Evan Guest with the collaboratrion of S.A.OMAR. 1980.

5-انتاج الفاكهة المستديمة الخضرة ج١،ج٢ ١٩٩١.
تأليف/ د. جواد ذنون آغا، د. داود عبدالله داود.

# بەشی دووەم

# ئەندازەی دەروونی

ن: د. محەمەد ئەلتکریتی
پەرچڤەی عبدالله محمود زەنگەنە

لەبەشی پێشوودا باس لە زمان و هەستەکان و بیرو باوەڕکرا کە هۆکاری سەرەکین بۆ دروست بوونی وێنەیەکی جیهان لە مێشکی مرۆڤدا.. هەروەها ئەوە روون کرایەوە کە ئەو سێ ڕەهەندە لەبەرئەوەی مەودای کارەکانیان سنووردارن، سنورێکیش دادەنێن بۆ ئاستی ئیدراکی مرۆڤ.. لێرە بەدواوە باسەکە تەواو دەکەین.

-ئێستاو دەرئەنجام

**حاڵەتی مێشکی:**

بێ گومان کاتێکت گوزەر کردووە کە کراوەو شادمان و بەختەوەر بوویت، کاتێکیش بووە کە خەمبارو دڵتەنگ و بە ئازار بوویت... کاتێك بووە گورج و گۆڵ و داهێنەرو خاوەن توانایەکی لەڕادەبەدەر بوویت لە ڕووی جەستەو ڕۆحەوە.. ئەو کاتە بەرهەمت زیاترو کارکردن باشترو بالاتر بووە. کاتێکیش بووە کە خاو و لاواز بوویت و توانای هیچ کارو کردەوەیەکت نەبووە.

هەوڵ بدە کە دیمەنێك، ڕووداوێك، حاڵەتێك بهێنێتەوەو یادت کە تیایدا شادمان بوویت، جارێکی دی بەفیکر بگەڕێرەوە بۆ حاڵەتەکەو.. بۆ ماوەی یەك دوو خولەك تیایدا بژی و هەوڵ بدە ساتەوەختە شادمانیەکان بهێنیتەوە یادت هەست بەچی دەکەیت؟ بزانە هیچ گۆڕانکاریەك لە هەستەکانت، لە هەناسەدانتا ڕوی‌داوە؟ هەرچەندە ڕەنگە چەند ساڵێك بەسەر ڕوداوەکەدا گوزەری کردبێت.. بەڵام تۆ توانیت جارێکی دی‌هەمان هەستەکانی ئەو ساتە وەختە دوبارە بکەیتەوە، واتە توانیت حاڵەتی مێشکیت بگۆڕیت بۆ خۆشی و شادمانی. ئێستاش حاڵەتێکی خەماوی بهێنەرەوە یادت، حاڵەتی تاڵی و سوێری، جارێکی دی بگەڕێرەوە ئەوساتە وەختانەو هەوڵ بدە بۆ ماوەی چەند چرکەیەك ((با لە چەند چرکەیەك زیاتر نەبێت))، ئەوسا بزانە هەست بەچی دەکەیت؟ بێ گومان هەست بە دڵتەنگی و ئازار دەکەیت.. وەرەوە سەر خوێندنەوەی ئەم بابەتە، ئاخۆ هەناسەت هیچ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە؟ ڕەنگە ئەوکاتە هەناسەیەکی قووڵت هەڵکێشابێت. بەڵام لەوساتەدا کەخۆت بەخوێندنی ئەم بابەتەوە خەریك دەکەیتەوە. وێنەی ڕوداو و یاداشتەکان بزردەبن.. بەڵام دەتوانیت هەرساتێك بتەوێت بانگیان بکەیتەوە نێو مێشکت کەواتە لەو چەند خولەکەی پێشوودا چەند جارێك توانیت حاڵەتی زیهنیت بگۆڕیت، واتە بە سێ حاڵەتی وەك:

خۆشحاڵی و شادمانی، ئازارو خەمناکی، حاڵەتی ئاسایی خوێندنەوەی ئەم بابەتەدا تێپەڕییت.. بەچی دەگەین لەوەدا؟ دەگەین بەوەی کە مرۆڤ بەچاوپۆشی لەدەورو بەری خۆی دەتوانێت حاڵەتی زیهنیی خۆی بگۆڕێت.. واتە خۆی خاوەنی جیهانی ناوەوەی خۆیەتی و دەتوانێت بەپێی پێویست کۆنترۆڵی بکات. مرۆڤ لە ژیانیدا بەردەوام لە حاڵەتێکی زیهنیەوە دەچێتە حاڵەتێکی دیکە. بێ گومان ئەم کردەی گۆڕانکاریە پشت بەستە بەچەند ڕەهەندێك.. لەوانەش شێوەی ناوخۆی دەرك کردن، کۆکراوەی کەڵەکەبووی نێو بیرەوەریی مرۆڤ بە بەتاڵ و شیرینەوە، لەگەڵ پاڵنەرەکان و .. هتد. حاڵەتی ئێستا کەباسمان لێیەتی ((Mental state) حاڵەتی ئێستای هەرکەسێك لە هەر ساتێك دا، بریتییە لەوەی کە ئەو کەسە بیری لێ دەکاتەوەو لە بەرخۆیەوە لێی دەدوێت و هەروەها بریتییە لە هەستکردنەکانی و کاردانەوەی ئەو هەستانەش لەسەر جەو جووڵ و هەناسەدان و تەعبیرەکانی ئەدگاریو جووڵەی چاوەکانی. دیارە لە فیزیادا باس لە حاڵەتی بزاوتی تەنێك دەکرێت ((شوێن و خێرایی و ئاڕاسته))ی ئەو تەنە یان حاڵەتی مادە ((ڕەقە.. شلە.. گازە)) بەهەمان شێوە حاڵەتی زیهنیی مرۆڤیش (بۆچوونەکانی، هەستەکانی، سۆزەکانی، فسیۆلۆژیەتی)).. هەروەك چۆن دەتوانێت حاڵەتی تەنێکی بزواو بگۆڕین، یان حاڵەتی مادە لە ڕێی بەکارهێنانی یاسا سروشتیەکانەوە.. وەك یاساکانی جووڵە، یاساکانی گەرمی بەهەمان شێوەو دەتوانین باری زیهنی بگۆڕین بۆ بارێکی نوێ، وەك هەستکردن بە خۆشی و دڵنیایی و خۆشەویستی و سۆزو گورج و گۆڵی و ئامادەیی، لە جێی هەستکردن بە خەمو ترس و لاوازیی.

لەم بابەتەدا یاساکان، یاخود فاکتەرو شێوازەکانی توانستی گۆڕینی حاڵەتی زیهنیی و خۆت و کەسانی دیش دەخوێنیتەوە دیارە فاکتەری وا دەخوێنیتەوە کە تیایدا دەبینیت گۆڕانکاریەکان گۆڕانکاری هەمیشەیی و بەردەوام دەبن.. بەو جۆرە هەرکات توانرا حاڵەتی زیهنی بگۆڕدرێت، ئەوا بێ گومان دەکرێت ڕەفتاریش بگۆڕدرێت، واتە داب و نەریت، پەیوەندیەکان، کارامەیی و لێهاتنەکان، تواناکان و ئەداکان.. هەروەها گۆڕینی هەستەکان و بیرکردنەوە.

- **ئامانج: بۆچی ئەم بابەتە دەخوێنیتەوە؟**

ئالێرەدا باسی (ئامانج) دەکەین یان دەرەنجامی کۆتایی (outcome) هەمو مرۆڤێکیش لەژیانی دا لەکارەکانی دا لەچالاکیەکانی دا لە هاتن و چوونی دا خواست و ئامانجی خۆی هەیە. بەڵام ئایا ئەو ئامانجانە دیارو ئاشکران، یاخود لێڵ و نادیارن؟ ئامانج بریتییە لە خواستێکی بنەڕەتیی ڕوون و ئاشکرا. دیارە خوێندکارێکی خوێندنی باڵا ئامانجی ئەوەیە کە ماستەر یان دکتۆرا وەربگرێت و یاریزانێکی تۆپی پێش دەخوازێت ببێتە ئەندامێکی هەڵبژاردەی وڵاتەکەی.. کەواتە هەمو مرۆڤێکی سەرکەوتوو ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە کە هەوڵی پێگەیشتنی هەیە.

ئامانج لێرەدا هاوتای نیازو نیەتە، بەڵکو دەتوانین بڵێین خودی نیازە و ڕەنگە ئەو نیازە لەگەڵ وتەوکرداردا هەماهەنگ بێت.. ئەو کاتە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆدەبێت و، ئەوکاتە بەڕوونی ئاسانی بە ئامانجەکانی دەگات، ڕەنگە نیازو وتەوکرداریش هەماهەنگ نەبن، ئەوکاتە مرۆڤ خۆیو خەڵکانی دیکەیش دەخەڵەتێنیت.. لە کۆتاییش دا دەگاتە ئامانجێکی دیکەی ویستراو.. کەواتە لێرەدا ئاکامیی بەدەست هێناوە لەسەرکەوتن دا، یاخود سەرکەوتوو بوە لە گەیشتن بە ناکامیدا.

کارکردن بەبێ دیاریکردنی ئامانجێك وەك ڕێکردن وایە بەبێ دیاری کردنی شوێنیکی دیاری کراو، ئەوکات ڕەنگە بگەیتە شوێنێکی جوان و لەبەر دڵان، یاخود بگەیتە شوێنێکی ناخۆش و نابەدڵ.. یان ڕەنگە هەر دەگەیتە کۆتاییەك. کەواتە دەرئەنجام بریتییە لە چەند دوا ئامانجێك کە بە ڕەنگ و دەنگ و هەست هەستیان پێ دەکرێت. بۆیە دەبێت وشەی تەواو و دیاری کراو بەکار بهێنرێت نەك وشەی ئاڵۆزو نادیار.. وەك بڵێیت: دەمەوێت دەوڵەمەندبم.. بەڵام ((دەوڵەمەندی)) وشەیەکی نەرمو فشەڵ و لاستیکییە، ئایا دەتوانیت بەچاوی خۆت دەوڵەمەندی ببینیت یان بەگوێی خۆت بیبیستی، یان دەستی لێ بدەیت؟ ڕەنگە بۆ من و تۆ ١٠٠٠ دۆلار سەروەت و سامانێکی زۆر بگەیەنێت، بەڵام ڕەنگە بۆکەسانی دی نرخی بۆینباخێك بێت.

**-چیت دەوێت؟**

ئەندازەی دەروونی زانست و هونەری سەرکەوتن و گەیشتنە بە باڵادەستی- دیارە هەنگاوی یەکەمیش لەودا دیاری کردنی (ئامانجە) تۆچیت دەوێت؟ هەرچەندە ئەوە پرسیارێکی سادەیە، بەڵام زۆرکەس هەن توانای وەڵامیان نیە، بۆیە ئەندازەی دەروونی هاوکارێکە لە دۆزینەوەی ئەو پرسیارەو چەندان پرسیاری دیکە لەبارەی (تەکنیکی)

سەرکەوتن و بالادەستی، ئاخۆ چیت دەوێت، فەرمان، بڕوانامە، پارەو پوول، هاوسەر، سەرکەوتنی وەرزشی، سەرکردایەتی، نوسەری، ژیانی بەختەوەری.. هتد.

گرنگ ئەوەیە کە بۆ هەر چالاکی و کردارێکت خاوەنی ئامانجێکی دیاری کراو بێت.

خوێندکارێکی خوێندنی بالا بۆ ماستەر نامەیەك لەساڵی ١٩٣٥ دا لە ئەمەریکا توێژینەوەیەکی ناوازەی کرد.. ئەو خوێندکارە ڕاپرسێکی لەنێو دەرچووانی ئەوساڵەی زانکۆدا کرد پرسیارەکەش بریتی بوو لەوەی، ئایا ئامانجێکی دیاری کراوت هەیە کەنوسیبێتت؟ دەرکەوت کە تەنها ٣٪ی ئەو خوێندکارانە ئامانجێکی دیاری کراویان بەنوسین هەبووە.

٢٠ساڵ دوای ئەو ڕاپرسە، خوێندکارەکە بەدوادا چوونێکی بۆکردن. بینیی تەنها ئەو لە ٣$ یە توانیویانە لەکارەکانیان دا سەرکەوتن و بالادەستی بەدەست بێنن بەدەست هێنانی سەرکەوتن پشت بەستە بەسێ بنەما:

*دیاری کردنی ئامانج.
*باشترین بەکارهێنانی هەستەکان.
*ئامادەیی و توانستی گۆڕانکاری.

تۆ ئێستا لەکات و شوێنێکی دیاری کراودایت.. کەواتە تۆ لە ((ئێستا))دایت، ئامانجیش بریتی‌یە لەو حاڵەتە نوێیەی کە دەخوازێت پێی بگەیت.. واتە حاڵەتی خوازراو لە میانەی کات و شوێنێکی دیاری کراودا. کەواتە ئامانجیش چوار چێوەیەکی کات و شوێنی هەیە.

هەرچی بەهەست بوونیشە، ئەوا واتای کۆکردنەوەی زانیاریەکان، چونکە بەڕادەی وریایی هەستەکان چەندێتی و چۆنێتیی زانیاریەکان هاوکاردەبن لە سەرکەوتن لە کردەی گۆڕینی حاڵەتی ئێستا بۆ حاڵەتی خوازراو.

مرونەت بریتی‌یە لە بەراوردکردنی حاڵەتی ئێستا لەگەڵ حاڵەتی خوازراو، بۆ ناسینی هۆکارو هەنگاوەکان و توانا پێویستەکان بۆ گەیشتن بەحاڵەتی ویستراو. ئێمە بەو هۆکارو هەنگاو توانایانە دەڵێین (( دەستەکەوتەکان- داهاتەکان)) دیارە مەبەستیش لەوە دۆزینەوەی خواستی نوێ واتە ئامادەییە بۆ گۆڕان. گۆڕینی نەریت و ئارەزوو بیروباوەڕو بەهاو پێوەرەکان و ڕەفتار. ئەگەر بتەوێت بگەیتە ئامانجێکی چەسپاو و دیاری کراو.. کەواتە دەبێت ((مرونەت))ت هەبێت لە هۆکارەکانی گەیشتن دا و بتوانیت بیرو ڕەفتارو هەستت بگۆڕیت. خۆ ئەگەر هۆکارەکانت نەگۆڕ بوون. ئەوا دەبێت ئامانجەکەت بگۆڕیت.

یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی ئەندازەی دەروونی بریتی‌یە لەوەی: ئەگەر ئەو شێوازە کارکردنەت دەتگەیەنێتە هەر ئامانجێك، ئەوا بێ گومان بەردەوامیت لەسەر هەمان شێوازی کارکردن بەهەمان دەرئەنجام و ئامانجت دەگەینێت لەهەموو جارێك دا.

واتە ناتوانیت بگەیتە ئامانجێکی چەسپاو، چونکە تۆ بە ڕەچاوەکردنی هەمان شێوازی کارکردنت بەهەمان ئامانجی پێشووتر دەگەیتەوە.

ئەگەر ئامانج نەگۆڕبوو.. دەبێت هۆکارەکان بگۆڕدرێن بۆ گەیشتن بە ئامانج.

### -چۆن ئامانج دیاری دەکرێت

١-دەبێت ئامانج هەمیشە پۆزەتیڤ بێت، واتە ئەوە دیاری بکەیت کە دەخوازیت نەك ئەوەی کە نایخوازیت، بۆ نموونە: دەبێت بڵێیت دەخوازم فلان کارو فەرمان بەدەست بهێنم.. نابێت بڵێیت نامەوێت بی کاربم- بڵێ دەخوازم فلان کەس بخوازم.. مەڵێ نامەوێت بەرەبەنی بمێنمەوە.

٢-دڵنیابە لەوەی کە دەتوانیت خواستەکانت بەدی بهێنیت بە چاوپۆشی لەوەی کە خەڵکانی دیکە ئەنجامی دەدەن. واتە خۆت بەرپرسیاری لەبەدی هێنانی ئامانجەکانت دا نەک کەسی بەرامبەر، تەنانەت گەر مەسەلەکە پەیوەندیی بەکەسێکی دیشەوە هەبێت...ئەوا ئەرکی سەرەکی لەسەر خۆتە.

٣-دەبێت بەردەوام ئاگادار بێت لەوەی کە لە ئامانج نزیک بوویتەوە یان نا، ئامانجت پێکاوە یان نا. چونکە خەڵک هەن کە نازانن بە ئامانجەکانیان گەیشتوون. چۆن دەزانیت کەبوویتە نوسەرێکی ناودار؟ ئایا بە دەرکردنی کتێبێك، یان بەنوسینی چەندەها بابەت و لێکۆڵینەوە؟ کەواتە دەبێت بەردەوام پێوەری خۆت هەبێت بۆسەرکەوتن.

٤-دەبێت هەموو وردەکاریەکانی ئامانجەکەت وەبیر خۆت بخەیتەوەو هەمیشە وابزانیت کە گەیشتوویت بە ئامانجەکانت و وەڵامی پرسیارەکانی کەی، چۆن، لەکوێ، کێ بەروونی و بەدرێژی بێت.

٥-لە هەموو لەمپەرەکان دا ئاگادار بە، ڕەنگە لەمپەر لەڕێدا نەبێت بەڵام دەشێت چەند ئامانجێکی دیکەت لەڕێدا بێت کە دژی ئامانجی سەرەکیت بن.

٦- دەبێت دەست پێشخەری بکەیت دەست بەکاربیت بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکەت. چونکە بەبێ کارکردن تەنها پەڕەیەکت دەبێت کە ئامانجەکانی لەسەر نوسراوە. پێویست نیە کارەکەت قورس و گران بێت، بەڵکو دەبێت وانەبێت. بەڵکو لای کەمی دەبێت دڵت بەکارەکەت خۆش بێت.

٧-پێویستە بەوردی و بەکورتی و بەڕوونی و لەسەر شێوازی دەستەواژەیەك یاخود ژمارەیەك ئامانجەکەت لەسەر لاپەڕەیەك بنووسیت و.. با ئەوەش نهێنی بێت و تەنها کەسی زۆر نزیکی لێ ئاگاداربێت.

٨-لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیە کە باوەڕت بە ئامانجەکەت هەبێت و یەقینت هەبێت کەپێی دەگەیت، بەڵکو واهەڵسوکەوت بکەیت کە بەدیت هێناوەو، لای خۆت ئەوە چەند بارە بکەیتەوەو وێنەی خۆت بێتە بەرچاو کە ئامانجەکەت بەدی هێناوەو گوێت لەوەبێت کە خەڵکی باست دەکەن بەتەواوی هەست بە هەموو ئەوانە بکەیت.

دیاری کردنی ئامانجەکان بەڕوونی و دواتریش چوونە حاڵەتێکی زیهنی و وێنەیی- دەنگی- هەستی کە ئامانجەکانت بەدی هێناوە، بێ گومان لە نەستدا تۆوی سەرکەوتن و داخوازیەکانی سەرکەوتن دەچێنێت- ئەوکات ئەقڵی ناهۆش واتە نەست هەمو توانا جەستەیی و دەروونیەکانت بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکان ئاراستە دەکات، کەواتە بەردەوام ئەم خشتەیەت لەیاد بێت.

| | | |
|---|---|---|
| ١ | پۆزەتیڤ | دەستە واژەی ئەرێ بەکاربێنە نەك نەرێ |
| ٢ | بەرپرسیارێتی | مەسەلەکە تۆیە نەك هی خەڵکی دی و بارودۆخ |
| ٣ | پێوەرەکان | چۆن دەزانیت کە لە ئامانج نزیك دەبیتەوە |
| ٤ | ڕوونی | کەی، لەکوێ، چۆن، کێ، وەڵامەکانی بەڕوونی |
| ٥ | لەمپەرەکان | ناسینی لەمپەڕەکان بۆ بەزاندن یان گوزەراندنیان |
| ٦ | کارکردن | دەست پێشخەری و هەنگاونان |
| ٧ | گەڵاڵەکردن | نوسینی ئەوەی دەخوازیت بەدی بێنێ |
| ٨ | بیرو باوەڕ | سوتەمەنی و هێزی بزوێنەر بۆ ئامانجەکان |

### سیستمی نواندن

کرداری دەرك کردن: لای مرۆڤ بەهاوکاری ٥ ڕەهەند ئەنجام دەدریت.

١-دەرك کردن بە هەستەکان
٢-ئاگایی
٣-بیرکردنەوە
٤-زاکیرە (یادەوەری)
٥-تەعبیر. یاخود زمان

هەر پێنج ڕەهەندەکەی بەشدار لەکردەی دەرك کردندا دەرك کردن بە هەستەکان لەریی ئەو زانیاریانەوە روو دەدات کە لە ریی ((بینین، بیستن، بۆن کردن، دەست لیدان، چەشتن))و دەگاتە میشك و دوای پەرلە کردنی زانیاریەکان راڤەدەکریتو دواتریش لیان حالی دەبیت. لە راستی ژمارەی هەستەکان شەشن نەك پێنج، چونکە هەستی شەشەم بریتییە لە هەستی بزاوتن (الحالة الحركية)) (Kinesthetic) ئیمە لەریی ئەم هەستەوە یەکە دەزانین ئەندامەکانی جەستەمان لە چ حالەتیك دایە بەبێ ئەوەی تەماشای بکەین. کەواتە ئەم هەستەیش دەخەینە لای هەستی دەست لیدان ((زبری و لوسی، گەرمیو ساردی)).. دواتریش هەستکردنی دەروونیمان هەیە وەك، ((ماندووبوون، خەمناکی، خۆشی، تورەیی)) هەمو ئەمانەیش دەچنە خانەی هەستەکانەوە. لەبەرئەوە هەستەکان وەك خۆیان بەپێنج هەست نامیننەوە.

### شیوەکان Modes:

هەر هەستکردنیکی لە دایك بوو لە هەستەکان دەبنە نوینەری شیوەیەکی تایبەتی ئیدراك. کەواتە دەرککردنی بەرهەم هاتوو لە ((بینینی هەرشتیك بریتییە لە "شیوەی وینەیی Visual " دەرککردنی بەرهەم هاتوو لە ((بیستنی)) دەنگیك دەبیتە شیوەی بیستن Auditory. دەرککردنی بەرهەم هاتوو لەهەستکردن دەبیتە شیوەی هەستی -

Kinesthetic - دیارە جاری وایش دەبیت کە دوو شیوە یاخود زیاتر لەیەك دەرککردن دا بەشدار دەبن.. وەك ئەوەی بالندەیەك دەبینین (ئەمەیان شیوەی وینەییە)) دەخوینیت ((ئەمەش شیوەی بیستنە)) هەروەها دەشکریت دەرککردن لە شیوەیەکەوە بگۆریت بۆ یەکیکی دی وەك ئەوەی کە ئیمە گرمەی فرۆکەیەك دەبیستین (( کە ئەمەیان شیوەیەکی بیستنە)) ئەوکات راستەوخۆ شیوەی فرۆکەکە دینینە بەرچاومان کە ئەمەش شیوەیەکی وینەییە) واتە شیوەی بیستنمان گۆری بۆ شیوەی وینەیی.

دیارە لەمبارەیەوە مرۆڤی نابینا بەردەوام شیوەکانی بیستن دەگۆریت بۆ شیوە وینەییەکان و لە میشکی خۆیاندا وینەی شتەکان دەبینن و زۆرجار دەبنە مایەی سەرسورمان. هەرچەندە هەرپێنج هەستەکەمان بەشدارن لە پرۆسەی دەرککردن دا.. بەلام بەشی زۆری هەست پێ کراوەکانو یاداشتەکانمان لەریی سێ هەستی سەرەکیەوە فەراهەم دین کە هەستەکانی (بینین)و (بیستن)و (هەست کردنە).

# دوا هەواڵەکان

### دوو بەریتانی و ئەمریکیەك پێکەوە پاداشتی نۆبڵی پزیشکی ئەمساڵ وەردەگرن.

سیدنی برینێر و جۆن سالتون و روبرت هورفیتس پاداشتی نوبڵی ئەمساڵیان بۆ پزیشکی بردەوە، بەهۆی تۆژینەوەکانیان لە ڕێکخستنی جینی دروستبوونی ئەندامەکانی لەش و مردنی بەرنامەکراوی خانەکاندا.

ستوکهۆڵم- لیژنەی پاداشتی نۆبڵی پزیشکی ساڵی ٢٠٠٢، ڕۆژی دوو شەممە ٢٠٠٢/١٠/٧ بەخشیە سیدنی برینێر (بەریتانیا) و روبرت هورفیتس (ئەمریکا) و جۆن سالستون (بەریتانیا) لەبەر تۆژینەوەوەکانیان "لە ڕێکخستنی جینی دروستبونی ئەندامەکان و مردنی بەرنامەکراوی خانەکاندا"

پەیمانگای کارولینکای سەربە نەخۆشخانەی گەورەی زانکۆ، کە هەمان ناوی لە ستوکهۆڵم هەیە، و ساڵانە پاداشتەکە دەدات ڕونی کردەوە کە: " هەرسێ کەسە براوەکەی ئەمساڵ لە بواری فسیۆلۆژیا/ پزیشکی دا، گەیشتونەتە دۆزینەوەیەکی گەورە دەربارەی ڕێکخستنی جینی بۆ ئەندامەکان و مردنی بەرنامەکراوی خانەکان"

ئەوسێ تۆژەرەوە، ئەو جینانەیان دۆزیوەتەوە کە کۆنترۆڵی لەشی کرمی کاینۆر دەکەن هەروەها مردنی خانەکانیشی، و توژەرەکان ئەوەشیان دەرخست کە کۆمەلە بۆ هیلیکی لەو جۆرە لە زیندەوەرەکانی دیکەشدا هەیە لەناویشیاندا مرۆڤیش.

پەیمانگاکە روونی کردەوە کە ئەم دۆزینەوەیە زۆر گرنگە لە بواری تۆژینەوەی پزیشکی داو یارمەتی دەریکی باشیشە بۆ تیگەیشتنی کۆمەلیکی گەورە لەو نەخۆشیانەی پەیوەندن بە لەناو چوونی خانەکانەوە بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندیان بە شیرپەنجەو ئەیدزەوە هەیە.

هەرسێ کەسە براوەکە، پاداشتەکە پیکەوە دابەش دەکەن کە بریتیە لە دە هەزار ملیۆن کرۆنی سویدی (١٠٠١ ملیۆن یۆرۆ) و پاداشتەکەش لە ١٠ی کانونی یەکەمی ئەمساڵدا لە ستوکهولم وەردەگرن.

**گوڵاڵە Internet**

### کچان زیاتر دوچاری کەم خوینی دەبن

کچان لە هەموو جیهاندا زیاتر دوچاری کەم خوینی دەبن بەهۆی ئەو گۆرانانەوە کە لە قۆناغی پیگەیشتن و دەست پێکردنی سوری مانگانەدا روو بەرووی دەبنەوە.

ئەو لیکۆلینەوە پزیشکیەی کە لەسەر کچانی ئەفریقیا ئەنجام درا دەری خست کە ژەمی هەفتانە لە ئاویتەکانی ئاسن و ترشی فولیك کاریگەرن بۆ پاراستن لە کەم خوینی ئەگەر ڕۆژانە ژەمەکان بە تەواوی وەربگیرین.

لکۆلەرەوەکان ئەوەیان روون کردەوە کە لە هەموو جیهاندا کچان زیاتر دوچاری تووش بوون بەکەم خوینی دەبن بەهۆی ئەو گۆرانانەوە کە لە قۆناغی پیگەیشتن و دەست پێ کردنی سوری مانگانەوە رووبەرووی دەبنەوە.

بەپێی ئامارە تەندروستیە جیهانیەکانی ڕیژەی تووش بوون بەکەم خوینی لە کچانی نەرویج دا دەگاتە ٤٪، لە ولاتە تازە پیگەیشتووەکاندا لە ٣٠ ٪ لەوانە نیپال، لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگاتە لە ٦٪.

بەپێی ئاماژە پزیشکیەکان چارەسەری پیوانەیی بۆ ئەم حالەتە بریتیە لە وەرگرتنی ژەمی ڕۆژانە لە ئاسن و ترشی فولیك بەشیوەی حەپ، لیکۆلینەوە تازەکان دەریان خست کە ژەمی هەفتانە هەمان کاریگەری هەیەو کەمتریشی تی دەچیت.

لیکۆلەرەوە پزیشکیەکان ئەم تیۆرەیان لەسەر ١٨١ کچانی شاری نیپال پراکتیزە کرد کە کەم خوێنی لە ناو یاندا بلاو بوو بووەوە، بۆ سێ کۆمەڵە دابەشیان کردن، کۆمەڵەی یەکەم ڕۆژانە حەپێکی ئاسن و حەپێکی ترشی فولیکیان وەرگرت، بەلام کۆمەڵەی دووەم هەفتانە هەمان ژەمیان لە حەپەکان خوارد، بەلام سێیەم کۆمەڵە هیچ حەپێکی چارەسەریان وەرنەگرت.

لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیان دۆزیوە کە ئەو دوو کۆمەڵەیە سوود مەند بوون کە ڕۆژانەو هەفتانە چارەسەریان بەکار هێناوە، و ڕێژەی تووش بوونی کەم خوێنی کەم بووەتەوە لە ٦٨,٦٪ وە بۆ لە ٢٠٪ لە کۆمەڵەی ژەمی ڕۆژانەدا، و لە ٧٠,١٪ وە بۆ لە ١٣,٤٪ لە کۆمەڵەی هەفتانەدا، بەلام هیچ باش بونێك لە کۆمەڵەی سێیەمدا رووی نەداوە کە هیچ چارەسەرێکیان وەنەگرتووە.

لێکۆڵەرەکان کورت کراوەی لێکۆڵینەوەکەیان لە گۆڤاری (پزیشکی منداڵان و مێرد منداڵان)دا بلاوکردەوە، ئەگەر کچان هەفتانە جارێك حەپێکی ئاسن و حەپێکی ترشی فولیك وەربگرن هەمان کاریگەری هەیەو کە متریشی تێ دەچێت بە بەراورد کردنی لە کاتێك دا ڕۆژانە وەری بگرن.

**لوتفیە Internet**